


## خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

- **شەیتان (کورتە ڕۆمان)**
- **نووسینی:** لیۆ تۆلستۆی
- **وەرگێڕانی:** ئەمین گەردیگلانی
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال ڕواندزی
- **بەرگ:** ڕێمان
- **پیتچنین:** م. شاسەنەم
- **نرخ:** ٣٠٠٠ دینار
- چاپی یەکەم ٢٠١٤
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانەی** موکریانی (هەولێر)
- بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەی گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٦٣) ساڵی ٢٠١٤ی پێی دراوە.

**زنجیرەی کتێب (٨٢١)**





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

کەوایە بە ئێوە دەڵێم هەرکەس بە چاوی هەوەس لە ژنێک بڕوانێ، هەر ئەو کاتە زیناحی لەگەڵ کردووە.

کەوایە ئەگەر چاوی ڕاستت هەڵتخلیسکێنێ، دەریهێنە و تووڕی هەڵدە، چونکە وا چاکە ئەندامێکی لەشت لە نێو بەری نەک هەموو جەستەت لە ئاوری دۆزەخدا بسووتێ.

ئەگەر دەستی ڕاستت هەڵتخلیسکێنێ، بیپەڕێنە و تووڕی هەڵدە، چونکە وات بە قازانجە ئەندامێکی لەشت لە نێو بەری، نەک هەموو جەستەت بکەوێتە دۆزخەوە.

ئینجیلی مەتی، بەشی پێنجەم، ئایەتەکانی بیست و هەشت و بیست و نۆ و سی.

# یەک

یۆڤگێنی ئیرتێنیێڤ ئیڤانۆڤیچ[1] داهاتوویەکی پڕشنگدار چاوەڕوانی بوو. هەموو شتێکیشی ئەوەی دەسەلماند. شێوەی پەروەردەی بنەماڵە، خوێندنی باڵا لە کۆلێژی مافی زانکۆی پترزبۆرگ، نزیکایەتی و پێوەندیی چڕوپڕی باوکی لەگەڵ کۆڕ و کۆبوونەوەی خانەدان و دەست ڕۆیشتووەکان و تەنانەت سەرەتای خزمەتی سەربازییەکەشی لە یەکێک لە وەزارەتخانەکان. ئەو لە گوند لە ژێر چاوەدێریی ڕاستەوخۆ و پشتگیریی گەرموگوڕی وەزیردا بوو. زۆریش دەوڵەمەند بوو و دەکرێ بڵێین پارەی لە پێستە گامێشدا بوو، ئەگەرچی پاراستن و ڕاگرتنی ئەو سامانە جێی گومان بوو. باوکی لە کاتی ژیاندا لە پترزبۆرگ نەگیرسایەوە و زۆربەی کات لە دەرەوەی وڵات ڕایدەبوارد. بۆ هەرکام لە کوڕەکانی یۆڤگێنی و ئاندرێ (کە ئەویان ئەفسەری گاردی سوارە بوو و لە یۆڤگێنی گەورەتر بوو) ساڵی شەش هەزار ڕۆبڵی بڕیبۆوە و خۆی و ژنەکەشی بە ڕاست و بە چەپ خەرجیان دەکرد و بۆ لە ئاوکردنی ماڵەکەیان پەردە لە چاویاندا نەبوو. تەنیا هاوینانە نزیکەی دوو مانگ لە مڵکەکەی خۆی

---

1- Yevgueni Irtenyev Ivanovich

دەمـــایەوە. بەڵام خـــۆی بە کاروبـــاری مەزرا و کشـــتوکاڵەوە مانـــدوو نەدەکرد و هەمـــووی بە گزیـــرەکەی ســـپاردبوو. گزیـــرەکەی ئەگەرچـــی زۆر جێی متمانەی بوو، بەڵام نانی کەوتبووە ڕۆنەوە و بە کەیفی دڵـی خۆی کیسەی بۆ هەڵدووریبوو، هەڵسووڕ و داسووڕەکەشـی تەنیا بـۆ بێتاقەتی و خۆخافڵاندن بوو.

یـۆڤگێنی دوای مەرگـی بـاوکی کاتێـک لەگەڵ بـراکەی دەیانویسـت مڵکومـاڵەکەی بەش بـکەن بۆیـان دەرکەوت کە هەسـتانەوەیان لە ژێـر بـــاری قەرز مەحـــاڵە، بـــۆیە بریکارەکەیـــان پێشـــنیاری پێکـــردن کە چاوپۆشـی لە میـرات و بەشـەماڵ بـکەن و بەو مڵـکە ڕازی بـن کە لە دایەگەورەیانەوە پێیان گەیشتبوو، نرخەکەشـی سـەدهەزار ڕۆبڵ بـوو. بەڵام خاوەنمڵکێـک کە دراوسـێی مڵـکەکەی ئەوان بـوو یەکێـک لەو کەســـانە بـــوو کە ئیرتنیـــڤ پێـــی قەرزدار بـــوو و چەنـــد ســـفتەی بە دەستەوە بوو، بۆیە بۆ وەرگرتنی قەرزەکەی هـاتبوو بـۆ پترزبـۆرگ و لەسـەر ئەو بـاوەڕەش بـوو کە ئەو دوو بـرایە سـەرەڕای ئەو هەمـوو قەرزەی لە پێیانـــدایە، دەتـــوانن بە فرۆشـــتنی بەشـــێک لەو مڵـــکە کاروبارەکەیـــان بـــخەنە ســـەر ڕاســـتەڕێ و مڵـــک و زەویـــوزارێکی باشیشـیان بـۆ دەمێنێتەوە. دەیانتوانی تەنیـا دارسـتانەکە و چەنـد پەڵە زەویـی بەیـار بفرۆشـن و مڵکـی سـەرەکیی سمیۆنۆڤسـکایا کە زۆر زەویـــوزارێکی پـــڕ پیـــت و بەنـــرخ بـــوو و لە چـــوارهەزار دیســـیاتین گۆشـتەزەوی و کارخـانەیەکی قەنـد و دووهەزار دیسـیاتین لەوەڕگە پێکهـاتبوو، بهێڵـنەوە بـۆ خۆیـان؛ بەو شـەرتەی کـاری پێڕاگەیشـتن و ڕەنێوهێنـانی لە ئەسـتۆی خۆیـان بـێ و لە سـەر مڵـکەکە دانیشـن، بە تەگبیروڕا کاری لە سەر بکەن و بە دار و بەردیدا نەدەن.

یۆڤگێنی سەر لە بەهار سەرێکی لە مڵکەکەی دا (باوکی لە چلەی ڕۆژوودا مردبوو) بارودۆخ و کاروبارەکەی لێکدایەوە و بڕیاری دا واز لە کاری دەوڵەتی بێنێ. لەگەڵ دایکی بگەڕێنەوە سەر مڵکەکە و لە گوند نیشتەجێ بن و خۆی کاروباری مڵک و مەزراکەی لە ئەستۆ بگرێ و بیپارێزێ، لەگەڵ براکەشی کە نێوانێکی خۆشیان نەبوو، بەڵێنی دا ساڵی چوارهەزار ڕۆبڵ یان یەکجێ هەشتاهەزار ڕۆبڵی بداتێ و ئاندرێ ئیتر هەقی بە سەر مڵک وماڵەکەوە نەمێنێ.

ئەو کارەی کرد و لەگەڵ دایکی هاتن لە سەر مڵکەکە و لە باڵەخانەی گەورەی ئاغاییدا نیشتەجێ بوون و بەوپەڕی توانا و لێهاتووییەوە دەستی کرد بە پێڕاگەیشتن و بەڕێوەهێنانی مڵک و مەزراکەی.

وا باوە دەڵێن پیران کۆنەپەرست ولاوان نوێخوازن. بەڵام ئەم بۆچوونە ڕاست نییە. لە زۆر لایەنەوە لاوان کۆنەخوازترن، ئەوان دەیانهەوێ بژین و نازانن بە چ شێوەیەک، دەرفەتی بیرکردنەوەیان نییە و ناتوانن باشترین شێوەی ژیان بدۆزنەوە و ناچار ڕێگایەک دەگرنە بەر کە پێشینیان بۆیان کێشاون.

ئێستا یۆڤگێنیش کەوتبووە ئەو بارودۆخەوە. کاتێک لە سەر مڵکەکەی نیشتەجێ بوو، خەون و ئامانجی ئەوە بوو کە ڕێگایەک بگرێتە بەر وەک باوکی نەبێ کە زۆر پیاوێکی کەمتەرخەم و دەستبڵاو بوو، بەڵکوو ڕێوشوێنی باوەگەورەی ڕەچاو بکات. ئەو ئێستا لە هەموو کاروبارەکانی باخ و ماڵ و مەزرا و بەڕێوەهێنانی مڵکەکەیدا، وێڕای ڕەچاو کردنی بارودۆخی سەردەم، هەوڵی دەدا ڕۆحی زەمانی باوەگەورەی زیندوو بکاتەوە و بناغەی ژیانێکی بەرز و ساماندارانە دابڕێژێ و لەگەڵ ئەوەدا کاروبارەکانی بە ڕێکوپێکی

بەڕێوەدەبا و ئاگای لە ماڵ و سامانەکەیەتی، پیاوێکی سایەچەور و دەستودڵبازیش بێ، تاکوو ژیانێکی خۆش و ئاسوودە بۆ خۆی و دەروبەرییەکانی دابین بکات و هەمووان لێی ڕازی بن. بەڵام داڕشتنی بناغەی ژیانێکی ئەوتۆ پێویستی بە ئەرک و ماندوو بوونی زۆر هەبوو. دەبوو خاوەن قەرز و بانکەکان ڕازی بکات و زەوی بفرۆشێ و کاتی پێدانەوەی قەرزەکان وەدوا بخات و کارێک بکات دەستی لێ ڕاگرن. دەبوو پارەیەکی زۆری بە دەستەوە بێ وکرێکار و خزمەتکار بگرێ تاکوو بتوانێ مڵکێکی گەورەی وەک سمیۆنۆڤسکایا بە چوارهەزار دیسیاتین زەوی و کارخانەیەکی قەندەوە ڕەنێوبێنێ. هەربۆیە هێندێ جار پەڵە زەویی بە ئیجارە دەدا و کرێکاری دەگرت تاکوو ماڵ و مڵکەکەی لە بارودۆخێکدا ڕاگرێ کە وەک مڵکێکی خۆش و ئاوەدان بنوێنێ.

کاروبارەکان زۆر بوون بەڵام وزە و هێزی فکری و جەستەیی یۆڤگێنیش کەم نەبوو. تەمەنی بیست و شەش ساڵ بوو. لاوێکی باڵا مامناوەندی و توندوتۆڵ بوو، قەڵافەت و ماسوولکەی لەشی بە وەرزش بەهێز بووبوون، لاوێکی خوێنگەرم و ڕووخۆش بوو، دەموچاوی سوور و ددانی سپی و لێوی تەڕ و سوور، تووکی سەری پڕ نەبوو، بەڵام زۆر نەرم و لوول بوو. تەنیا عەیبێکی کە لە ڕواڵەتیدا وەبەرچاو دەکەوت زلکوێری بوو کە ناچاری دەکرد چاویلکە لە چاو بکات، بە جۆرێک کە هەمیشە چاویلکەی پێنسی لە چاو دەکرد و شوێنی لە سەر لووتە قەڵەنگییەکەی دانابوو. ئەوە ڕواڵەتی، بەڵام لە بار ڕوحییەوە هەتا زیاترت بناسیبایە و لێی نزیک بوایەی زیاترت خۆشدەویست، دایکیشی ئەوی لە هەموو کەسێکی خۆشتر دەویست و ڕۆح و گیانی لەگەڵی بوو. بەڵام ئێستا دوای مەرگی مێردەکەی نەک

ژیـــانی لەبەر ئەو دەویســـت، بەڵکـــوو هەمـــوو خۆشـــی و ئـــاوات و خەونەکـــانی دنیـــای لە چـــاوی ئەودا دەدی. خۆشەویســـتی یـــۆڤگێنی وەنەبـــێ تەنیـــا لە دڵـــی دایکیـــدا بـــێ، بەڵکـــوو هاوڕێیـــانی قوتابخـــانەی دواناوەندی و زانکۆش خۆشیاندەویست و ڕێزێکی زۆریان بۆ دادەنا. وەها چووبووە دڵی خەڵکەوە سوێندیان بە سەری دەخوارد و جێگای باوەڕ و متمانەی خەڵکی بوو. هەر قسەیەکی بکردایە بڕوایان پێدەکرد و هیچ کەس نەبوو لێی بە گومان بێ و بە پیاوێکی فێڵبازی بزانێ یان پێـی وابـێ ئەو ڕوخسـارە کـراوە و شـەریفە و بەتـایبەتە چـاو و دڵە پاکەکەی ڕێژەیەک گەرد و غەدری ناپاکیی تێدابێ.

لەســەریەک ســەرتاپای لەشــی لە هەمــوو کارێکیــدا یارمەتیــدەری بـــوون. خـــاوەن قەرزێـــک کە لەگەڵ هـــیچ کەس نەدەســـازا و بـــۆ وەرگـرتنەوەی ڕۆژێـک لە سـەر هـیچ کەس ڕانەدەوەسـتا، لە لای ئەو وەک مێو و ڕۆنـی لـێ دەهـات و هەرچـی یـۆڤگێنی بیگوتبـایە قەبووڵی دەکـرد. بەڕێـوەبەری نووسـینگەکەی، یـان کوێخـا و گزیرەکـان، یـان ڕەعیەتەکانی کە لەوانە بوو فێڵ و دزیوفزی لە ئاغایەکی تر بکەن و لە کارەکانیاندا خۆ بگنخێنن و زیانی پێ بگەیەنن، لە لای ئەو بە دڵ و بە گیان تێوەدەچوون و بۆ خزمەت کردن و بەڕێوەبردنی کارەکانی ڕێژەیەک درێخییان نەدەکرد. چونکە ئەوانیش بۆیان دەرکەوتبوو ئەو ئاغـا ڕووخـۆش و مێهرەبـان و دروسـتکارە لێڵـی لە کاریـدا نیـیە و دڵسۆزی خەڵکە و چکۆلەترین زوڵمیان لێ ناکا.

کۆتـایی مـانگی مەی بـوو. یـۆڤگێنی توانیبـووی دوای زەحمەتێکـی زۆر ئەو زەویـــیە بەیـــارە وەرگـــرێتەوە کە لە بـــارمتەدا داینـــابوو و بیفرۆشێ بە بازرگانێک و بڕێکیش قەرز لەو بارزگانە وەرگرێ تاکوو پێداویستییەکانی کاروباری ملک و گوندەکەی پێ دابین بکات. لەوانە

گای جووتی و ئەسپ و عارەبانە و لەوانەش گرینگتر باڵەخانەیەکی گەورە و پڕشکۆ لە مەزرایەکدا ساز بکات کە زۆر پێویست بوو. کارەکان هەموو جێبەجێ کران، داریان هێنا، دارتاشەکان دەستبەکار بوون و هەشتا داشقەیان پەیین دەردا. لەگەڵ ئەوەشدا داهاتووی ملکەکە بە تاڵە موویەک بەند بوو.

# دوو

هاوکات لەگەڵ ئەو کێشە و گرفتانە مەسەلەیکی تر هاتە پێشێ و ئەگەرچی گرینگایەتییەکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام لەو کاتەدا زۆری ئازار دەدا. ئەو کوڕێکی لاو بوو و هەتا ئەو کاتە وەک زۆربەی هەرزەکارانی تەندروست و ڕەبەن جحێڵایەتیی کردبوو. یانی لەگەڵ هەموو جۆرە ژنێک پێوەندی و کەینوبەینی بووبوو. لاوێکی هەرزە و تۆلاز نەبوو بەڵام هەروەک لە دڵی خۆیدا بیری لێ دەکردەوە، تەرکەدنیاش نەبوو. لە لای خۆی وای دانابوو ئەم لارێ بوون و ڕابواردنانە بۆ تەندروستی و هاوسەنگی و ئازایی بیر و خەیاڵی پێوست بوو، بۆیە خۆی تێوە دەگلاند. لە تەمەنی شازدەساڵییەوە ئەو ڕێگایەی گرتبووە بەر و هەتا ئەو ڕۆژە هەموو شتێک بە خێر و خۆشی گوزەرابوو، یانی تووشی زێدەڕۆیی نەبووبوو و لە عەیاشیدا ئاوی لە ئاوەڕۆ دەرنەکردبوو، لەو ماوەیەدا قەت دڵی نەکەوتبووە داوی ژنێک و قەتیش نەخۆش نەکەوتبوو. سەرەتا لە پترزبۆرگ لەگەڵ ژنێکی بەرگدروو کەینوبەینی ساز کردبوو، بەڵام ئەو ژنە بووبوە خراپکار، ئەویش وای بە باش زانیبوو خۆی لێ لادا و وازی لێ بێنێ. ئەم لایەنەی ژیانی جۆرێک دابین کرابوو کە خەمی هیچی نەبێ و بە خەیاڵێکی ئاسوودەوە ڕایبوێرێ.

بەڵام ئێستا نزیک دوو مانگ بوو لە گوند نیشتەجێ بووبوو و نەیدەزانی چبکا. پارێز کردنی نابەدڵ وردەوردە شوێنێکی خراپی لە

سەر ڕۆحی دانا. نەیدەزانی بۆ ئەو کارە بچێ بۆ شار یان نا. ئەگەر بشچێ، کوێی هەیە لێی بمێنێتەوە؟ لە ناخەوە شڵەژابوو. ئەو مەسەلەیە وای لێکردبوو ئاراوقارای لێ هەڵگیرابوو، چونکە سوورسوور دەیزانی ئەو جۆرە پێوەندییە پێویستییەکی ڕۆحییە و ناتوانێ چاوپۆشیی لێ بکات و کڵاو لە سەر خۆی بنێ؛ هەر بەڕاستیش وەکوو پێویستییەکی حاشاهەڵنەگری لێ هاتبوو بۆی و لەو ململانێیەدا بەزیبوو. بە جۆرێک کە هەستی دەکرد ئازاد نییە و چاوی بێ ئیختیار هەموو ژنێکی جحێڵی ڕاو دەکرد و دیتنی ژنان تەزوویەکی چێژبەخشی بە جەستەیدا دەهێنا.

سەرەڕای ئەو هەموو تامەزرۆییە، پێکهێنانی پێوەندی لەگەڵ ژنانی گوندەکەی بە کارێکی کرێت و نەشیاو دەزانی. بیستبووی کە باوکی و باوەگەورەی بە پێچەوانەی ئاغاکانی دیکە هەردووکیان لەو کارانە بەدوور بوون و هیچ کات ژنێکی نامەحرەم یان بەستۆکە پێی نەناوەتەماڵیان و قەتیان شەڕواڵی حەرام دانەکەندووە، بۆیە لە دڵەوە بڕیاری دا ئەویش ڕێگای ئەوان بگرێتە بەر و تەماح لە نامووسی ڕەعیەتەکانی نەکا.

بەڵام دواتر کە دیتی کەوتۆتە بەندی گرانی هەوەسەوە و ئۆقرەی لێ هەڵگیراوە، دیتی لە شارۆچکەکەی نزیک خۆیان نەدیو و نەناسیاو دادەمێنێ و هیچی پێ ناکرێ؛ بۆیە بیری کردەوە ڕۆژگاری کۆیلەداری بەسەرچووە و بەو ئاکامە گەیشت کە دەتوانێ دەوای دەردەکەی خۆی هەر لە گوندەکەدا بدۆزێتەوە، بەڵام بەڵێنی بە خۆی دا کە لەو ڕێگایەدا هێندە بە پارێزەوە هەنگاو هەڵگرێ کە هیچ کەس پێی نەزانێ و خۆشی هەتا ملان تووشی زەلکاوی عەیاشی نەبێ و هەر ئەوەندە تامەزرۆیی و ئارەزووی خۆی بشکێنێ؛ قەستیشی بۆ ئەو کارە تەنیا

بۆ باری لەشساغی بوو. بەڵام کاتێک بڕیارەکەی دا خەم و نیگەرانی لە ناخیدا سەری هەڵدا و ئاراوقارای لێ هەڵگرت. هەرجارێک کە لەگەڵ کوێخا یان ڕەعیەتەکان یان دارتاشەکە قسەی دەکرد، بێ ئیختیار باسەکەی دەبردەوە سەر ژنان و کاتێک باسەکە دەهاتە سەر ژنان، هەوڵی دەدا بابەتی باسەکەیان لەو بازنەیە نەترازێ. وردەوردە وای لێ هات بە چاوێکی تۆڵاز و کڕیارانە چاوی لە ژنان دەکرد.

# سێ

یـۆڤگێنی ئیرتنیـڤ بە جێـیەک گەیشـتبوو کە بـۆی دەرکەوت ئەو بڕیارەی بە خۆی داوە شتێکە و بەڕێوەبردنی بڕیارەکەش شـتێکی تـر. هەڵبەت خۆی نەیدەتوانی بچێت بۆ لای ژنێک. بچێ بـۆ لای کـێ؟ بـۆی دەرکەوت دەبـێ واسـیتەیەک بـدۆزێتەوە، بەڵام بـۆ ئەو کـارە دەبـوو یارمەتی لە کێ وەرگرێ؟

ڕۆژێک بۆ ئاوخواردنەوە چوو بۆ ماڵی بێشـەوانێک کە سـاڵانێک لە کاتی ڕاودا یاریدەدەری باوکی بووبوو. سەری قسەی لەگەڵ بێشەوان کردەوە و بێشەوان گەلێکی چیرۆک و سەربردەی کۆنی ڕاوچییان بۆ گێڕایەوە کە چۆنیـان عەیاشـی کـردووە و ڕایـانبواردووە. یـۆڤگێنی لە دڵی خۆیدا گوتی: «زۆر باش دەبێ ئەگەر بتوانم مەبەستی خۆم هەر لێـرە لە لای ئەم بێشــەوانە دەربـڕم و بـۆ ئەو کـارە ڕاوێـژی لەگەڵ بـکەم.» بەڵام نەیـدەزانی چـۆن مەبەسـتەکەی خـۆی بـدرکێنێ و بڵێـی دانـیلای[2] پیـر ئەو دەڵاڵییەی بـۆ بکـات و ئەرکـی ئەو کـارە لە ئەسـتۆ بگـرێ؟ بڵێــی بەو پێشــنیارە هەڵنەبەزێــتەوە و لێــی نەڕەنجــێ و بە بێزارییەوە لە خۆی دوور نەخاتەوە؟ بڵێی بەو پێشنیارە خۆی نەبێتە هـۆی ئـابڕووچوونی خـۆی؟ بەڵام ڕەنـگە زۆر بە ئاسـانیش ڕازی بـێ. لەگەڵ ئەوەی گـوێی بـۆ قسـە و بەسـەرهاتەکانی دانـیلا شـل کردبـوو

---

2- Danila

بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن ئەو مەبەستەی خۆی دەربڕێ. دانیلا بۆی باس کرد کە جارێک لە کاتی ڕاودا لە شوێنێک مابوونەوە و لایان دابووە ماڵی ژنێکی شەماس و ئەو خۆی دەلالّیی کردبوو و ژنێکی بۆ پریانیچنیکۆڤ[3] ساز کردبوو.

یۆڤگێنی لە دڵی خۆیدا گوتی: «وا دیارە هەڵنابەزێتەوە!»

- بەڵام باوکت خودا لێی خۆشبێ خۆی لەو جۆرە کارانە نەدەدا.

یۆڤگێنی لە دڵی خۆیدا گوتی: «نا، ناکرێ!» بەڵام بەو مەبەستە کە دەراوی دەمی تاقی بکاتەوە گوتی: «بەڵام تۆ چۆن خۆت بەو کارانە ڕمووردە دەکرد؟»

- بۆ چبووە؟ خۆ کارێکی خراپم نەکردووە، ژنە خۆی ڕازی بوو، فیۆدۆر زاخاریچیش لە خودای دەویست و زۆری پێخۆش بوو. منیش ڕۆبڵێکم وەدەست دەکەوت. بێچارە چبکا؟ خۆ بەردودار نەبوو، دڵی هەبوو! خواردنی باشی دەخوارد و زۆریشی ڤۆدکا دەخواردەوە!

یۆڤگێنی دیسان بە خۆی گوت: «باشە، وا دیارە قسەی لەگەڵ دێ!»

لەپڕێکدا سەری هەڵبڕی و گوتی: «ڕاستت دەوێ، منیش...» هەر خێراش هەستی کرد ڕوخساری بنەوش هەڵگەڕاوە. «... دەزانی چی دانیلا، منیش وەک ئەو وام. بێ ژنی دەردێکی گرانە. بەڕاستی تاقەتم لێ بڕاوە!»

دانیلا زەردەیەکی گرت و یۆڤگێنی درێژەی بە قسەکانی دا: «... خۆت دەزانی خۆ من ڕاهیب و تەرکەدنیا نیم! خووم پێگرتووە.»

---

3- Pryanitchnikov

هەستی دەکرد ئەو قسانەی دەیکا زۆر گەوجانەیە. بەڵام کاتێک بۆی دەرکەوت دانیلا لە دەردی تێدەگا، دڵی خۆش بوو.
دانیلا گوتی: «دەی باشە بۆ زووتر دەنگت نەکرد؟ خۆم کارەکەت بۆ جێبەجێ دەکەم! بەڵام ئەوەندەم پێ بڵێ کێت دەوێ؟»
ــ بۆ من فەرق ناکا. هەر ئەوەندە ناحەز نەبێ و نەخۆش و عەیبداریش نەبێ.
دانیلا گوتی: «تێگەیشتم!» تۆزێ بیری کردەوە و گوتی: «دانەیەکی زۆر ناسک و نایابم پێ شک دێ... بیبینی دڵت دەیگرێ.» یۆڤگێنی دیسان سوور هەڵگەڕا. «ئەگەر بزانی چ ناسکە ژنێکە ...» تۆزێ دەنگی نزم کردەوە و درێژەی بە قسەکانی دا: «ئەم پاییزە شووی کردووە و مێردەکەی دوور لە ڕووی ئێوە هیچی پێ ناکرێ، هەردەڵێی یەختە کراوە! ژنەش دەڵێی تۆپەگوڵە. بۆ کەسێک کە سەری لەو کارانە بخورێ، شتی وا هەر نییە.»
یۆڤگێنی نێوچاوانی گرژ کرد و گوتی: «نا،نا .. من هی ئاوام ناوێ. من بە پێچەوانە (جا پێچەوانەی ئەو شتە چی بوو کە دەیویست، هەر خۆی دەیزانی) تەنیا دەمەوێ لەشساغ بێ و گێرەوکێشەم بۆ دروست نەکا. بۆ وێنە ژنی سەربازێک بێ کە لە مێردەکەی دوورە، یان کەسێکی لەو شێوەیە.»
دانیلا گوتی: «دەزانم، دەبێ ستێپانیدات بۆ بێنم. مێردەکەی لە شار کار دەکا. ڕاست وەک ئەوەیە سەرباز بێ و لە ئەرتەشدا خزمەت بکا. ژنەش زۆر خاوێن و شۆخوشەنگە. دەزانم پێی ڕازی دەبی. چەند ڕۆژ لەمەوبەر تووشی بووم پێم گوت: «تۆ لێرە بڕۆ... ئەویش لە شار ...»
ـ دەی باشە کەنگێ؟

ـ سبەینێ! ئێستا دەچم تووتن دەکڕم. لەوێوە سەرێکی لێدەدەم. سبەینێ کاتی نیوەڕۆ، وەرە بۆ ئێرە! یان حەمامی پشت سەوزیخانەکە! جێگایەکی باش و پەنایە. نیوەڕۆش کاتی چاکە، هەموو خەڵکی خەریکی سەرخەو شکاندنن.

ـ زۆر باشە!

کاتێک یۆڤگێنی گەڕایەوە بۆ ماڵێ، تووشی دڵەخورپە و شڵەژانێکی قورس بوو. بە خۆی دەگوت: «بڵێی چ بێ؟ ژنێکی گوندنشین بڵێی چ جۆرە بوونەوەرێک بێ؟ ئەوە گریمان هاتە ژوان و ژنێکی ناحەز و بۆگەن بوو چبکەم؟» بەڵام کە هێندێ ژنی وەبیر دەهاتەوە، بە چاوی کڕیار تەماشای کردبوون، بە خۆی دەگوت: «نا، ئەوانە هەموویان شۆخوشەنگن! بەڵام من دەبێ چیی پێ بڵێم، چبکەم؟»

ئەو ڕۆژەی بە دەم فیکر و ئاڵۆزییەوە تێپەڕ کرد. بۆ سبەینێ کاتژمێر دوازدەی نیوەڕۆ چوو بۆ ماڵۆچکەی بێشەوانەکە. دانیلا لە بەردەرگاکە ڕاوەستابوو. بەبێ ئەوەی زمانی بگەڕێ، بە سەر ئاماژەی بۆ لای دارستانەکە کرد. یۆڤگێنی دڵی کەوتە کوتەکوت. هەستی کرد خوێن گوشاری بۆ دڵی هێناوە. ڕۆیشت بۆ لای سەوزیخانەکە. بەڵام هیچ کەسی لێ نەبوو. چوو بۆ لای حەمامەکە. لەوێش هیچ کەسی نەدی. چاوی لە نێو حەمامەکە کرد، کاتێک لەوێ هاتە دەرێ، گوێی لە قرچەی شکانی لقێک بوو کە لە ژێر پێی کەسێکدا شکایەوە. سەری بۆ لای وەرسووڕاند، ژنە لە نێو دەوەنێکی ئەوبەری شیوەکە ڕاوەستابوو. یۆڤگێنی بە هەڵەداوان ڕۆیشت بۆ لای و بە لێژایی شیوەکەدا داگەڕا. نێو شیوەکە پڕ بوو لە گەزگەزک و هەتا نەکەوتە نێوی نەیزانی. گەڵای گەزگەزک پێستی دەست و لاقی دەکزاندەوە و دەتگوت سەدان زەرگەتە پێوەی دەدەن. چاویلکەکەی لە

چاو بەربۆوە، بەوبەری شیوەکەدا هەڵگەڕا و خۆی گەیاندە لای ژنە. ژنە بەروانکەیەکی سپی گوڵدۆزی کراو لەبەردا بوو لەگەڵ تەنوورەیەکی سووری مەیلەو قاوەیی، لەچکەیەکی سووری کاڵی بە سەردا دابوو. بەلەکی ڕووت و سپیوسۆڵ و ناسک. لە پاڵ دەوەنێکدا ڕاوەستابوو و بە شەرمەوە زەردەیەکی لە سەر لێو بوو.

ـ ئێرە کوێرەڕێیەکی لێیە دەوری شیوەکە لێدەدا. دەبوو لەوێوە بێی. ئێمە لەمێژە لێرە ماتڵین[٤].

یۆڤگێنی لێی نزیک بۆوە و چاوێکی لە دەوروبەری کرد، باوەشی پێداکرد و دەستی بە سەر و پرچ و ڕوومەتیدا هێنا و لاواندیەوە.

دوای چارەکە سەعاتێک لێک هەڵبڕان. چوو لە نێو گەزگەزکەکان چاویلکەکەی دۆزییەوە، چوو بۆ لای دانیلا و لە وەڵامی ئەودا کە گوتی: «بە دڵت بوو ئاغا؟» یەک ڕۆبڵی پێدا ڕۆیشتەوە بۆماڵێ. دڵخۆش و ڕازی بوو. سەرەتا هەستی بە شەرم کرد بەڵام دواتر زاتی شکا و هەموو شتێک بە پێی خواستی دڵی خۆی بوو. لە هەموو گرینگتر ئەوە بوو کە ئێستا هەستی بە ئۆخژن و حەسانەوەیەکی ڕۆحی دەکرد و زۆر شاد و کەیخۆش بوو. ئەو تەنانەت بە جوانی چاوی لە ژنەکە نەکردبوو. تەنیا ئەوەی لە بیر بوو کە ژنێکی خاوێن و ناسک و بەنەشە بوو. زۆر سادە بوو و ناحەزیش نەبوو. دیار بوو ژنێکی بادیەهەواش نییە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «بڵێی ژنی کێ بێ؟» دانیلا گوتبووی ناوی پێچینکۆڤا[٥]یە ئێرە دوو بنەماڵەی لێیە کە ناویان پێچینکۆڤە. ڕەنگە بووکی میخاییلی پیر بێ. بەڵێ، حەتمەن بووکی ئەوە، کوڕەکەی میخاییل لە مۆسکۆ کار دەکا. دەبێ لە دانیلا بپرسم.»

---

٤- ژنە بە هۆی خاکەڕایییەوە بە جێی "من" دەڵێ "ئێمە"

5- Petchinkova

لەوە بەدوا ئەو گرفتەی ژیانی گوند، یانی پارێزگاریی ناچاری، کۆتایی پێ هات. ئیتر بیرئالۆزی تووشی گرفتی نەدەکرد و ئەو دەیتوانی بەبێ هیچ کۆسپ و تەگەرەیەکی ڕۆحی بە کاروباری ملّکەکەی ڕابگا.

بەلاّم ئەو کارەی یۆڤگێنی لە ئەستۆی گرتبوو کارێکی ئاسان نەبوو. هێندێ جار هەستی دەکرد دەرەقەتی ئەو هەموو کێشە و گرفتارییە نایەت و کارەکەی بە جێیەک دەگا ناچار بێ ملّکەکەی بفرۆشێ. خەمی ئەوەی بوو هەموو هەوڵ و ڕەنجەکانی بە فیڕۆ بڕوات و لەوە گرینگتر ئابڕووشی بچێ. چونکە مەعلووم دەبوو نەیتوانیوە خۆڕاگری بکات و ئەو ئەرکەکەی لە ئەستۆی گرتووە نەیتوانیوە بە ئاکامی بگەیێنێ. بۆیە ئەو مەسەلەیە زۆر خەمباری کردبوو. گرفتاریش یەک بە دوای یەکدا دەهاتن و هەتا کونێکی دەگرت، دوو کونی دیکەی تێدەبوو کە بە خەونیش بیری لێ نەکردبۆوە.

لەو ماوەیەدا بەردەوام قەرزی تازەی دەهاتە پێ و کەسانێک دەهاتن بەربینگیان پێدەگرت کە هیچ کەس لەو قەرزانە ئاگادار نەبوو. وا دیار بوو باوکی لە کۆتایی تەمەنیدا لە دەیان شوێن وامی وەرگرتبوو. لە مانگی مەیدا کە میراتەکەیان بەش کرد، یۆڤگێنی پێی وابوو لە هەموو حیساب و کیتابەکان دەگا و هەیی و قەرزەکانی هەمووی مەعلوومە؛ بەلاّم لە ناکاو لە نێوەڕاست مانگی هاویندا نامەیەکی بە دەست گەیشت کە بە پێی ناوەرۆکی نامەکە وامێک بە گوژمەی دوازدەهەزار ڕۆبڵ بە بێوەژنێک بە ناوی یەسیبۆڤا[6]

---

6- Yessupova

قەرزدارە. ژنە هیچ سفتەیەکی بە دەستەوە نەبوو، تەنیا پسوولەیەکی دەنواند کە نافەرمی بوو و بە پێی وتەی بریکارەکەی ئەو پسوولەیە هیچ بایەخێکی یاسایی نەبوو. بۆیە یۆڤگێنی دەیتوانی نارەزایەتی دەربڕێ و نەچێتە ژێر باری ئەو قەرزە. بەڵام یۆڤگێنی تەنانەت بە زەینیشیدا نەهات کە چۆن دەکرێ لە نایاسایی بوونی ئەو پسوولەیە بە گومان بێ و نەچێتە ژێر باری دانەوەی قەرزی باوکی. تەنیا دەیویست بزانێ بەڕاستی وامێکی ئاوا لە گۆڕێدا بووە یان نا.

لە کاتی خواردنی نانی نیوەڕۆدا یۆڤگێنی لە دایکی پرسی: «دایە گیان، ئەرێ ئەم کالریا ڤلادیمێرۆڤنا یەسیبۆڤایە[7] کێیە؟»

ـ یەسیبۆڤنا، ئەو کچەیە وا باوەگەورەت بەخێوی کرد، لە بیرت نییە؟ بۆچی دەپرسی؟

یۆڤگێنی بابەتی نامەکەی بۆ دایکی ڕوون کردەوە.

دایکی گوتی: «بەڕاستی سەیرە! باوکت ئەو هەموو چاکەیەی لەگەڵ کردووە و یارمەتیی داوە، چۆن پێی عەیب نییە!»

ـ من کارم بە سەر ئەوەوە نییە ئەو پێی عەیب بێ یان نا، دەمهەوێ بزانم ئێمە پێی قەرزدارین یان نا؟

ـ جا بڵێم چی ڕۆڵە گیان؟ ئەوەندە من بزانم هیچ قەرزێکی لە سەرمان نییە. باوکت بەو هەموو دڵۆڤانی و دەستودڵبازییەوە ...

ـ تۆ تەنیا ئەوەندەم پێ بڵێ، باوکم خۆی بە قەرزداری ئەو دەزانی یان نا؟

ـ بڵێم چی ڕۆڵە گیان؟ جا من چووزانم، من تەنیا ئەوەندە دەزانم تۆ بەبێ ئەو قەرزەش حاڵت زۆر شڕە.

---

7- Kalerya Vladimirovna

یۆڤگێنی دیتی ماریا پاولۆڤنا لەوە ئاگادار نییە و وا دیارە هەوڵ دەدا لە هەستی دڵی ئەو ئاگادار بێ.

گوتی: «وا دیارە دەبێ بیدەینەوە. سبەینێ دەچم بۆ لای بەڵکوو ماوەیەک دەستم لێ ڕاگرێ و پاکتاوی حیسابەکە بخاتە دواوە.»

ماریا پاولۆڤنا کە دیار بوو خاترجەم بووە و ئەو بڕیارەی کوڕەکەی بۆ ئەوە دەبێ شانازیی پێوە بکا، گوتی: «ئاخ، ڕۆڵەکەم، نازانی چەندەم دڵ پێت دەسووتێ! بەڵام چبکەین، وا چاکترە بیدەینێ. کە دیتت، پێی بڵێ ماوەیەک دەستمان لێ ڕاگرێ.»

هۆکارێکی دیکەش هەبوو کە یۆڤگێنی خستبووە تەنگژەوە، ئەویش کێشەی دایکی بوو، ئەو پیرێژنە ئەگەرچی لەگەڵ ئەو دەژیا، بەڵام لە بارودۆخی داهات و خەرجی کوڕەکەی ئاگادار نەبوو. ئەو چونکە هەمیشە لە فەرعانە و ئاسوودەییدا ژیابوو، خووی بە هەڵەخەرجی گرتبوو و شەشوبێش پێدا دەدا و دڵی بەماڵی دنیا نەدەسووتا. ئەو نەیدەتوانی هەست بەو بارودۆخە قورسە بکات کە کەوتبووە سەر شانی کوڕەکەی و بە بیریشیدا نەدەهات کە لەوانەیە ئەمڕۆ یان سبەی کارەکەیان بە جێیەک بگا کە هیچیان بە دەستەوە نەمێنێ و بکەونە سەر ساجی عەلی. ئەوکاتە کوڕەکەی ناچار دەبێ دارونەداری بفرۆشێ و بگەڕێتەوە بۆ سەر خزمەت و ببێتە فەرمانبەری دەوڵەت؛ ئەوکاتەش دەبێ بارودۆخی ژیانیان لەگەڵ ئەو مووچەیە بگونجێنن کە وەریدەگرت و ئەویش دیار بوو لە دووهەزار ڕۆبڵی تێناپەڕێنێ. ئەو نەیدەزانی دەرباز بوون لەو تەنگژەیە تەنیا بە دەست پێوەگرتن و کەم کردنەوەی خەرجەکان مەیسەر دەبێ. هەر بەو هۆیە نەیدەتوانی تێبگا کە بۆچی یۆڤگێنی تەنانەت لە خەرجە ناگرینگەکان، بۆ وێنە خەرجی باخەوان و گەوڕ و خزمەتکارەکان و تەنانەت خواردن، ئەوەندە

دەسـت پێـوەدەگرێ و قیرسـیچمەیی دەنـوێنێ. جـگە لەوشـە وەک زۆربەی بێوەژنەکان بە ڕێزوە ناوی مێردەکەی دێنا و زۆر زیاتر لە کاتی زیندوو بوونی پەسنی کەسایەتی و ئاکارەکانی دەدا، تەنانەت بۆ تـاقە جارێـک بە بیریـدا نەدەهـات کە ئەوەی ئەو خـودا لێخۆشـبووە کردوویەتی نادروست بێ یان بڕیارەکانی هەڵوەشێنێتەوە.

یـۆڤگێنی بە زەحمەتێکـی زۆر توانیبـووی بـاخ و نارنجسـتانەکە بە دوو بـاخەوان و گەوڕ و گەلەخـانەکەش بە دوو مەیـتەر بەڕێـوە ببـا. ماریا پاولۆڤنا بە هـۆی سـاویلکەییەوە پێـی وابـوو ئەگەر بۆڵەبۆڵ بە سەر ئاشپەزە پیرەکەدا نەکات کە هەرچی لێی دەنا بیخۆن و ڕێگاوبان و باریکەڕێی نێو باخەکە بە جوانی ئاوپڕژێن و کەسک نەدەدرا و بە جێی چەند خزمەتکار تەنیا وروێرکەیەکی هەیە، فیداکارییەکی زۆری لە هەقی کوڕەکەیدا کردووە، دەشیزانی تامڵ کردنی ئەو کەمایەسییانە دژوارە، هەر بۆیە پێی وابـوو ئەم قەرزەی دوایـیش کە هـاتبووە پێـی، بووبـووە دەردی سـەرباری دەردان و هەمـوو کاروبارەکـانی لـێ دەشـێواند. بەڵام لە لایەکـی دیـکەوە بەوە دڵخـۆش بـوو کە کـوڕەکەی مرۆڤێکی پاک و دەستودڵبازە و ئەو ئەرک و دژوارییانە شلوێی ناکا. جـگە لەوەش ماریـا پاولۆڤنـا زۆر نیگەرانـی بـاری مـاڵیی کـوڕەکەی نەبـوو، چـونکە دڵنیـا بـوو بـووکێکی دەوڵەمەنـد و زەماوەنـدێکی بەخـتەوەرانە چـاوەڕوانیەتی و دوای ژن هێنـان ئەو بـارە قورسـە لە سـەر شـانی لادەچـێ و لەو هەمـوو گرفـت و تەنگژەیە دەربـاز دەبـێ. دەیان بنەماڵەی دەناسی کە لە خودایان دەویست کچەکەیان شـوو بە یۆڤگێنی بکات و ئەو حەزی دەکرد هەرچـی زووتـر ژن بـۆ کـوڕەکەی بێنێ.

# چوار

یۆڤگێنیش زۆر لە بیر و خەیاڵی ژن هێناندا بوو. بەڵام نەک وەکوو دایکی. ئەو بیرە بە لای ئەوەوە زۆر ناحەز و پڕ سووکایەتی بوو کە پێکهێنانی ژیانی هاوبەش پردێک بێ بۆ پەڕینەوە لە تەنگانە و گرفتە ماڵییەکان. ئەو حەزی دەکرد پێکهێنانی ژیانی هاوبەش لە سەر بنەمای ڕاستی و دوور لە حیساب و کیتابی ماڵی و لە چوارچێوەی ئەشقێکی پاک و ڕاستەقینەدا دابڕێژێ. ئەو کچانەی چاوی پێیان دەکەوت یان دەیناسین، بە چاوێکی وردبینانەوە لێی دەڕوانین و بە خەیاڵ خۆی لە پاڵیاندا دادەنا. بەڵام چارەنووس کارەکەی بۆ یەکلایی نەدەکردەوە،. هەر لەو کاتەدا پێوەندیی لەگەڵ ستپانیدا دەرێژەی هەبوو کەینوبەینەکەیان زۆر گەرموگوڕ بوو، ئەوەش شتێک بوو کە ئەو بیری لێ نەکردبۆوە و چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد. یۆڤگێنی بە دڵ لە عەیاشی و داوێن پیسی بێزار بوو و ئەم پێوەندییە شاراوەیەی لەگەڵ ستپانیدا زۆر بە لایەوە کارێکی دزێو بوو، وەهای تووشی ئازاری ویژدان کردبوو کە بە هیچ شێوەیەک بۆ درێژە پێدانی هەوڵی نەدەدا. دوای یەکەم ژوان لەگەڵ ستپانیدا ئاواتی دەخواست کە جارێکی تر نەیبینێتەوە، بەڵام دوای ماوەیەک دیسان هەستی بە خەمۆکی و نیگەرانی کرد و هۆکاری ئەوەشی بۆ زێدەڕۆیی کردن لە پارێزگاری گێڕایەوە. بەڵام ئەمجارەیان شێواوی و نیگەرانییەکەی لە ژێر پەردەی

تەمـــومژدا شـــاردرابۆوە و تەنـــانەت شـــوێنی لە ســـەر ڕواڵەت و هەستیشـــی دانـــابوو. ئەو وای لـــێ هـــاتبوو تەنـــانەت چـــاوە ڕەش و گەشـــەکانی ژنە و بەژنوبـــاڵای دەهـــاتنە بەرچـــاوی و ئەو دەنـــگە لە قـوولایی سـینگیدا دەبـوو بە زایەڵە و دەیگـوت: «ئـێمە لە مێـژە لێـرە مـاتڵین!» هەروەهـا ئەو بۆنە خۆشـەی لەشـی شـلک و ناسکی هەست پێدەکرد و مەمکە قوتەکانی کە لە ژێر بەروانکە سپییەکەیدا سـەریان هەڵـدابوو و وەک جـووتێ کـارگی کەمـا هەڵتۆقیبـوون، لە بەرچـاوی وەســەما دەکەوتــن؛ ئەم فیکــر و خەیــالانە لەگەڵ دیمەنــی ســەوزی بـاخەکە و داری فنـدق و بـووز و هەتـاوی گەرمـی دەمەو نیـوەڕۆ و شنەی نەرمی گەڵای تەرچک و درەوشـاوەی دارەکان، دەسـتیان دایە دەستی یەک تاکوو دیسـان قەراری ژوانێکـی تـر لە نێو دارستانەکە و کاتی نیوەڕۆ بەرەو شوێنی دیاری کراو سەری پێ هەڵبگرێ.

یـۆڤگێنی ئەمجارەیـان زۆر بە وردی چـاوی لە لەشـولار و چـاو و ڕوومەتـی ژنە کـرد و زۆر جـوان و دڵڕفێنـی هـاتە بەرچـاو. هەوڵـی دا قســەی لەگەڵ بکــات ســەبارەت بە مێــردەکەی لێــی بپرســێ و بــۆی دەرکەوت مێردەکەی کوڕی میخائیلی پیرە و لە مۆسکۆ عارەبانەچییە.

یۆڤگێنی دەیویست لێی بپرسێ چۆن دڵت بڕوایی دەدا خیانەت بە مێردەکەت بکەی و گوتی: «دەی، پێم بڵێ تۆ چۆن؟ ...»

ژنە گوتی: «من چۆن، مەبەستت چییە؟» دیار بوو ژنە زۆر وریایە و لە مەبەستەکەی یۆڤگێنی تێگەیشتووە.

ـ مەبەستم ئەوەیە تۆ چۆن ڕێگا بە خۆت دەدەی بێی بۆ لای من؟

ژنە بە پێکەنینەوە گوتی: «جا ئەوە قسـەیە! مەگین ئەو لە مۆسـکۆ ڕاینابوێرێ؟ ئەویش لەوێ هەرچی پێی خۆشە با بیکـا، مـن کـارم پێـی نەداوە. من خۆ پێی قەرزدار نیم! چی بووە، خۆ لێم کەم نابێتەوە!»

دیار بوو هەوڵ دەدا وا بنوێنێ کە ژنێکی بوێر و ڕووهەڵماڵدراوە و ئەوەش زۆر بە لای یۆڤگێنییەوە شیرین بوو. کاتی بەجێ هێشتنی ژوانگە، یۆڤگێنی نەیویست بەڵێنی ژوانی داهاتوویان دیاری بکا و تەنانەت ژنە پێشنیاری پێکرد کە واز لە دەلاڵیی دانیلا بێنێ و دیار بوو حەز بەوە ناکات، بەلام یۆڤگێنی قەبووڵی نەکرد؛ چونکە پێی وا بوو ئەمە دوایین ژوانیان دەبێ. ئەو ژنەی زۆر بە دڵ بوو. بە خۆی دەگوت کە ئەو پێوەندییە لە ڕووی ناچارییەوەیە و قەیناکا، خۆ زیانیش بە هیچ کەس ناگەیێنێ، بەلام لە ناحی دڵی خۆیدا داوەرێکی سەختگیرتر هەبوو کە ئەو ژوانانەی پەسند نەدەکرد و هیوادار بوو کە دوایین جاری بێ. ئەو لانیکەم نەیدەویست لەو بڕیارەدا هاوبەش بێت و قەرار و بڕیاری ژوانی داهاتوو دیاری بکات.

وەرزی هاوین لە نیوەی تێپەڕی و لەو ماوەیەدا یۆڤگێنی دە دوازدە جاز چووە ژوانی ستپانیدا و هەموو جارێکیش دەلاڵەکەی دانیلا بوو. جارێک ژنە نەیتوانیبوو لە ژوانە ئامادە بێ، چونکە مێردەکەی لە ماڵێ بوو و دانیلا ویستبووی ژنێکی دیکەی بۆ بێنێ بەلام یۆڤگێنی بە بێزارییەوە پێشنیارەکەی ڕەت کردبۆوە. پاشان مێردەکەی ڕۆیشتەوە بۆ مۆسکۆ و ژوان و پێوەندییەکان سەرلەنوێ دەستی پێکردەوە. سەرەتا دانیلا دەلاڵییەکەی دەکرد و دواتر خۆیان قەرار و بڕیاری ژوانی داهاتوویان دیاری دەکرد و ستپانیدا لەگەڵ ژنێکی گوندنشینی تر بە ناوی پرۆخۆرۆڤا دەهات، چونکە شیاو نەبوو ژنێکی مێردار بە تەنیا بچێت بۆ نێو دارستان. جارێک کە قەراری ژوانیان دیاری کردبوو، بنەماڵەی کچێک کە ماریا پاولۆڤنا دەیویست داوای بکات بۆ کوڕەکەی، هاتن بۆ ماڵی یۆڤگێنی و ئەو بە هیچ شێوەیەک نەیتوانی خۆی بدزێتەوە و لە کاتی خۆیدا بچێت بۆ

ژوانــگەکەی. بەڵام هەرکە میوانەکــانی ڕۆیشــتن، بەو بیــانووەی کە دەچــێ بــۆ ســەر خەرمــانەکە، بە کوێرەڕێیەکـدا خــۆی گەیانـدبووە دارسـتانەکە و جێژوانەکەیـان، بەڵام درەنـگ گەیشـتبوویە و ژنە لەوێ نەمابوو. لە شوێنی دیدارەکەیان هەتا ئەو جێیەی دەست دەیگەیشتێ، لقی چەند دار گێلاس و فندق و تەنانەت نەمامی بووزێک شکابوونەوە. دیار بوو ژنە لە چاوەڕوانیدا بێ تـاقەت بووە و لە داخانـا ڕقی خۆی بەو لق و پەلانە ڕشتووە و شوێنەواری بێ قەراریی خۆی بۆ ئەو بە یادگار بەجێ هێشتبوو. یۆڤگێنی ماوەیەک چـاوەڕوان بوو، بەڵام بۆی دەرکەوت ڕاوەستانی بێهۆیە و بەپەلە ڕۆیشت بۆ لای دانیلا و داوای لێکرد بۆ ڕۆژێکی تر قەراری ژوانی بۆ جێبەجێ بگات. بۆ سبەینێ ژنە هات و وەک هەمیشە بە گەرموگوڕی لەگەڵیدا بوو.

بەم شێوەیە وەرزی هـاوین کۆتـایی هـات. جێژوانەکەیـان بەردەوام لە نێـو دارسـتانەکە بـوو، تەنیـا جارێـک لە کۆتـایی هاوینـدا چـوونە کادێنێک و ئـاوێتەی یەک بـوون. یـۆڤگێنی ئیڤـانۆڤیچ تەنـانەت بۆ تـاقە جـارێکیش بە زەینیـدا نەهـات کە ئەم پێوەنـدییە گرنگـایەتییەکی هەبـێ بۆی یان لە دڵیدا جێیەکی بـۆ کـردبێتەوە. پـارەی دەدا بە ژنە و خـۆی ئاسوودە دەکرد و پێی وابوو ئیتـر کـار تەواوە و کۆتـایی پـێ هـاتووە. ئەو نەیـدەزانی و بیـری نەدەکـردەوە کە هەمـوو خەڵکـی ئـاوایی بەو پێوەنــدییەی ئەو و ســتپانیدایان زانیــوە و تەنــانەت زۆربەی ژنــان ئێـرەییش بەو ژنە دەبەن و لە لایەکـی دیـکەوە کەسـوکاری ژنە پـارە وەردەگرن و هانی دەدەن بۆ ئەو کارە. بۆیە ژنەش وا کەوتبـووە ژێـر کاریگەریی پارە و هاندان و سازانی بنەمـاڵەکەی کە بیـری لە تـاوان و خەیـانەت بە مێـردەکەی نەدەکـردەوە. پێـی وابـوو چـونکە ژنـانی گونـد

زۆربەیان ئێرەیی پێ دەبەن، ئیتر ئەو کارەی دەیکا ڕەوایە و نابێ بیر لە هیچ شتێکی تر بکاتەوە.

یۆڤگێنی لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «ئەو کارەی من تەنیا بۆ پاراستنی لەشساغی خۆمە و کەوایە کارێکی پێویستە. من دەزانم کارێکی باش نییە و ئەگەرچی هیچ کەسیش باسی ناکا، بەڵام هەمووما‌ن یان زۆربەی خەڵک لێی ئاگادارن. ئەو پیرێژنەی لەگەڵیدا دێ، هەموو شتێک دەزانێ و حەتمەن لە لای خەڵک گێڕاویەتەوە. بەڵام چیم پێ دەکرێ؟ دەزانم ئەم پێوەندییە ئاکامێکی باشی نییە، بەڵام چبکەم؟ هەرچییەک بێ، زۆر ناخایێنێ.»

گرینگترین شت کە بووبووە هۆی پەشۆکاویی یۆڤگێنی، مێردی ژنەکە بوو. سەرەتا خۆشی نەیدەزانی بۆچی پێی وابوو دەبێ مێردی ژنە پیاوێکی گولە و نابووتە و زۆریش خوێڕی بێ، هەرئەوەش بووبووە هۆی ئەوەی لە دڵی خۆیدا پاکانە بۆ خۆی بکات و هەق بدا بە ژنە و خۆی بە تاوانبار نەزانێ. بەڵام کاتێک چاوی بە مێردەکەی کەوت، بە جارێ تووشی سەرسووڕمان بوو. لاوێکی زۆر جوانچاک و ڕێکوپێک بوو، هیچ شتێکی لەم کەمتر نەبوو و لە هێندێک لایەنەوە زۆریش لەم زیاتر و جوانچاکتر بوو. لە یەکەم دیداردا بە ژنەی گوت کە چاوی بە مێردەکەی کەوتووە و زۆری کەوتۆتە بەر دڵ و لاوێکی جوانچاک و قۆزە...

ژنە بە خۆی نازی و گوتی: «لەم گوندەدا وێنەی نییە!»

یۆڤگێنی سەری لەو وەڵامە سووڕما. لەو ڕۆژە بە دواوە بیر کردنەوە لە مێردی ئەو ژنە زۆری ئازار دەدا. جارێک کە چووبوو بۆ لای بێشەوانەکە، دانیلا زۆر ڕاشکاوانە لە کاتی قسە کردندا پێی گوتبوو: «میخاییل چەند ڕۆژ لەمەوبەر لە منی پرسی ڕاستە ئاغا

لەگەڵ ستپانیدا کەینوبەینی هەیە؟ من گوتم ئاگادار نیم. بەڵام پێم گوت، وا باشترە لە ئاغا تێکەوێ نەک لەگەڵ لادێییەکی چڵکنوپڵکن!»

ـ دەی ئەو گوتی چی؟

ـ جا چی بڵێ؟ گوتی ڕاوەستە دەبێ ئەو مووە لەو ماستە دەربکێشم. ئەگەر ڕاست بێ بووکەکەم خراپە، هەردوو چاوی دەردێنم!

یۆڤگێنی لە دڵی خۆیدا گوتی: «دەی کاتێک مێردەکەی هاتەوە، ئیتر من تخوونی ناکەوم و دەستی بۆ نابەم.» لە کۆتایی هاوین و سەرەتای پاییزدا ئەوەندەی گیروگرفت و کێشەی ماڵ و مەزرا بە سەردا ڕژابوو فریای سەرخوراندن نەدەکەوت: بینا کردنی باڵەخانە و کاروباری دروێنە و خەلەوخەرمان و لە هەمووی گرینگتر دانەوەی قەرز و فرۆشتنی زەویی بەیار. ئەمانە هەمووی کێشە و گرفتارییەک بوون کە بە جارێ پابەندیان کردبوو و شەو و ڕۆژ سەرقاڵی ئەو ئیشە بێ دواییانە بوو. ئەمانە هەمووی ژیانی ڕاستەقینە بوون. پێوەندی و کەینوبەینی لەگەڵ ستپانیدا نەبوو (ئەو ئیتر بە پێوەندیی نەدەزانی) بەڵکوو وەک شتێکی دێمۆدە چاوی لێدەکرد و لێی بێزار بوو. بەڵام کاتێک گڕی هەوەس بەردەبووە هەناوی، وەها ئۆقرەی لێ هەڵدەگیرا ئیتر بیری لە هیچ شتێکی تر نەدەکردەوە. بەڵام ئەو حاڵەش زۆری نەدەخایاند. قەراری ژوانێکی دادەنا و دەچووە لای ژنە و ئیتر هەتا حەوتوویەک یان جاری وابوو هەتا مانگێک لە بیری دەچووەوە.

لە پاییزدا یۆڤگێنی زیاتر دەچوو بۆ شار. لە شار لەگەڵ بنەماڵەی ئاننێسکی[8] ئاشنایەتی پەیدا کرد. ئەو بنەماڵەیە کچێکیان بوو کە تازە

8- Anneski

قوتابخـانەی دواناوەنـدیی کچـانی تەواو کردبـوو و ڕووداوێـک هـاتە پێشێ کە ماریا پاولۆڤنای زۆر بێ تاقەت کرد، ئەو پیرێژنە دەیگوت ئەو داخە کوشـتوومی کە کـوڕەکەم خـۆی هەزرانفـرۆش کـردووە. ڕووداوەکەش ئەوە بـوو کە یـۆڤگێنی خـوازبێنی لە لیـزا ئاننێسـکایا کردبوو.

لەو ڕۆژە بە دواوە ئیتـر وازی لە سـتپانیدا هێنـا و چـاوی پێـی نەکەوت.

# پێنج

هیچ کەس نەیدەزانی یۆڤگێنی بۆ لیزا ئاننێسکایای کردە دەزگیرانی خۆی. بە جۆرێک کە هیچ کات ناتوانی بە باشی تێبگەی کە بۆچی پیاوێک ئەم ژنە نا ژنێکی تر بۆ هاوسەری هەڵدەبژێرێ. هۆکاری ئەرێنی و نەرێنی زۆر بوون. یەکێک لەو هۆکارانە ئەوە بوو کە لیزا ماڵ و سامانێکی ئەوتۆ لە تاپۆی شووکردنەکەیدا نەبوو، لە لایەکی تریشەوە لەو کچانە نەبوو کە ماریا پاولۆڤنا بۆ کوڕەکەی دەستنیشان کردبوو. هەروەها کچێکی ساویلکە بوو و کاتێک پێوەندیی ئەوت لەگەڵ دایکی دەدی، دڵت پێی دەسووتا. هۆکارێکی دیکەی ئەوە بوو کە کچە زۆر جوان نەبوو و سەرنجی کەسی ڕانەدەکێشا، بەڵام ناحەزیش نەبوو. بەڵام هۆکاری سەرەکی ئەو هەڵبژاردنە، ئەوە بوو کاتێک یۆڤگێنی بە تەواوی لە کچە نزیک بۆوە، بیری ژن هێنان بە تەواوی لە مێشکیدا یەکلایی بووبۆوە، ئاشقی کچە بوو چونکە دڵنیا بوو دەیهەوێ ژن بێنێ.

ئەو سەرەتا تەنیا حەزی بە دیتنی لیزا ئاننێسکایا دەکرد، بەڵام کاتێک بڕیاری دا زەماوەندی لەگەڵ بکات، ئەشق و خۆشەویستیی کچە لە دڵیدا ڕیشەی داکوتا و هەستی کرد بەبێ ئەو ناژی.

لیزا کچێکی لاواز و باڵابەرز بوو. هەموو شتێکی درێژ بوو، لە لووتیەوە بگرە هەتا لاق و قامک و دەموچاوی. (لووتی قیت نەبوو بەڵکوو بە شێوەیەکی قەڵەنگی بۆ لای لێوی خوار بووبۆوە.) ڕەنگی

ڕوخساری زۆر ناسک و جوان بوو، سپییەکی مەیلەو زەعفەرانی، کوڵمەکانیشی سوور بوو. بسکەکانی درێژ و خورمایی و نەرم و خاو بوون، چاوەکانیشی گەش و جوان و پڕ لە خۆشەویستی بوون، یەکپارچە متمانە. هەر ئەو چاوانە بوون کە هۆش و ئیختیاریان لە یۆڤگێنی بڕیبوو و هەر جارێک کە بیری لە لیزا دەکردەوە ئەو چاوە جوان و نەرم و پڕ متمانەیەی ئەوی دەهێنایە بەرچاوی خۆی.

ئەمە ڕواڵەتی ئەو بوو. یۆڤگێنی هیچ ئاگادارییەکی لە باری ڕوحیی لیزاوە نەبوو و جگە لە چاوە جوانەکانی، هیچ شتێکی دیکەی نەدەدی. دەتگوت ئەو چاوانە ئەوەی کە پێویستە بیزانێ پێ دەڵێن و تێی دەگەیێنن. ئەوە بوو مانای چاوەکانی لیزا.

لیزا لە سەردەمی قوتابخانەدا و لە تەمەنی پازدە ساڵییەوە، بەردەوام هەر پیاوێکی جوانچاک و قۆزی دەدی ئاشقی دەبوو، تەنیا ئەو کاتانەش شادی لە دڵی دەگەڕا و هەستی بە بەختەوەری دەکرد کە ئاشقی کەسێک دەبوو. کاتێک قوتابخانەشی تەواو کرد هەروا خەریکی دڵداری و حەزلێکردویی بوو و لە دڵتەڕیی خۆی نەکەوت. بۆیە کاتێک چاوی بە یۆڤگێنی کەوت لەڕێوە عاشقی بوو، ئەو ئەشقە تایبەتمەندییەکی بە چاوی لیزا بەخشیبوو کە یۆڤگێنی بێ ئیختیار شەیدا و ئاشقی بوو.

زستانی ئەو ساڵە لیزا هاوکات حەزی لە دوو کوڕی گەنج دەکرد و نەک تەنیا ئەو کاتەی دەچوونە ژوورەکەیەوە، بەڵکوو لەو کاتەوە کە پێشخزمەتەکەیان هاتنیانی ڕادەگەیاند و ناوی دەهێنان هەتا ئەو کاتەی دەچوونە ژوورێ، سوور هەڵدەگەڕا و تووشی هەیەجان دەبوو. بەڵام دواتر کە دایکی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ تێیگەیاند کە یۆڤگێنی ئیرتنێڤ بە تەمایەتی و بەڕاستی دڵی پێوەیەتی، وەها ئاشق

و شەیدای ئەو بوو کە دوو دڵدارەکەی پێشووی خۆی بە تەواوی لە بیر خۆی بردەوە. بەڵام کاتێک چاوپێکەوتنەکانی یۆڤگێنی لە ماڵی خۆیان بەردەوام بوو و لە کۆڕی سەما و شادییەکاندا ئەوی بۆ هاوسەمای خۆی هەڵدەبژارد و بە ئاشکرا دەیویست لە هەستی دڵی سەبارەت بە خۆی تێبگا، وەها شەیدای بوو کە وەک نەخۆشی لێهات و ساتێک بێ یۆڤگێنی هەڵی نەدەکرد. لیزا لە خەونیشدا ئەوی دەدی و لە کاتی بەخەبەریشدا ئەوی لە ژووره تاریکەکەیدا دەدی و جگە لە ئەو هەموو کەس و هەموو شتێک لە بەرچاوی نادیار بوون و چاوی تەنیا بۆ دیتنی ئەو دەویست و دڵی تەنیا بۆ خۆشەویستی ئەو. کاتێک یۆڤگێنی هات بۆ خوازبێنی و ڕێوڕەسمی مارەبڕین بە شادی و خۆشی بەڕێوەچوو، دوای ئەوەی بوون بە دەزگیران و یەکتریان ماچ کرد، ئیتر لیزا هیچ بیر و خەیاڵێک لە مێشکیدا نەما جگە لە بیر و خەیاڵی یۆڤگێنی و ئاوات و ئارەزووی تەنیا ئەوە بوو لە پەنای ئەو بێ و ئاشقی بێ و خۆشی بووێ. لیزا شانازیی بە ئەشقی ئەوەوە دەکرد و بۆ دیتنی چرکەکانی دەژمارد و نەیدەویست بۆ چاوتروووکاندنێک لێی دوور کەوێتەوە. کاتێک بیری لە خۆی و ئەشقی ئەو دەکردەوە لەوانە بوو لە خۆشیانا شێت بێ. کاتێک لێی دوور دەبوو لەوانە بوو گیانی دەرچێ و هۆش و ئیختیاری لا نەدەما. یۆڤگێنی هەتا زیاتری دەناسی، زیاتر خۆشی دەویست. ئەو قەت چاوەڕوانی نەدەکرد بەو شێوە عاشق بێ و دڵی بکەوێتە داوی کەسێک و ئەو حاڵەش ئەوەندەی دیکە ئەشقەکەی گەرم و بەتین دەکرد.

# شەش

بەر لە هـاتنی بەهـار یـۆڤگێنی چـوو بـۆ سمیۆنۆڤسـکایا، تـاکوو بە کاروباری ملْک و مـاڵەکەی ڕابگـا و لە هەمـوو گرینگتـر فەرمـان بـدات ماڵ و جێگاوڕێگا بۆ زەماوەند و ژیانی تازەی ئامادە بکەن.

ماریـا پاولۆڤنـا ئەم هەڵبـژاردنەی کـوڕەکەی بە دڵ نەبـوو، ئەویـش تەنیا بەو هۆیە بوو کە ئەو بووکە شیاوی ئەوە نییە کوڕەکەی ژیـانی هاوبەشی لەگەڵ پێکبێنێ و کچی زۆر باشتری بۆ هەڵنـابوو؛ هەروەهـا حەزی لە چارەی ڤارڤارا ئەلکسـی یۆڤنـا نەدەهـات کە دایکی لیـزا بـوو. ئەو نەیـدەزانی کە ئەو خـاتوونە دڵپـاکە یـان بەدزاتە و لەو بـارەیەوە بیروڕای خۆی دەرنەدەبڕی. بەڵام هەر لە یەکەم چاوپێکەوتنەوە بۆی دەرکەوتبـوو کە ژنێکـی خـانەدان و نەجیبـزادە نیـیە، دەیگـوت ژنێکـی بەرزە ڕەوشت نییە و ئەوەی زۆر بە لاوە تـاڵ و دژوار بـوو. بۆیەش تـا ئەو ڕادەیە دژی ئەو خزمـایەتییە بـوو چـونکە خـووی بەوە گرتبـوو ئەسـڵ و نەسـەب و نەجیبزادەیـی بە لاوە زۆر مەزن بـێ و دەیزانـی یـۆڤگێنی سـەبارەت بەو شـتە زۆر هەسـتیارە و خەمـی ئەوەی بـوو کوڕەکەی لە داهاتودا هەست بە سـووکایەتی و دۆڕان بکـات. کچەشـی تەنیا لەبەر ئەوە خۆش دەویست کە دەیدی کوڕەکەی ڕۆح و گیانی لە لایەتی، بۆیە ناچار بوو بووکەکەی خۆش بووێ و دڵـی خـۆی بـۆ ئەو خۆشەویسـتییە ئامـادە کردبـوو، لەو ئامـادە بوونەشـدا ڕاسـت و یەکڕەنگ بـوو. کاتێـک یـۆڤگێنی هـاتەوە بـۆ مـاڵێ، دیتـی دایکـی شـاد و

دڵخۆشـە. خەریک بوو ماڵەکەی بۆ بووک ڕێکوپێک دەکرد و خۆی ئامادە دەکرد ئەویَ بەجیَ بێڵیَ. یۆڤگێنی هەوڵی دا پێملی بکات لە لای ئەوان بمێنێتەوە، بەڵام دایکی سوور بوو لەسەر ئەوەی لە ماڵەکە بڕواتە دەریَ و بە تەنیا بژی.

شەویَ ماریا پاولۆڤنا بە پێی خووخدەی خۆی فاڵی وەرەقێکی گرتەوە و کوڕەکەی لە پاڵیدا دانیشتبوو و یارمەتیی دەدا. کاتی خۆمانەترین دەردەدڵەکان بوو. ماریا پاولۆڤنا دوای ئەوەی جارێک فاڵی گرتەوە، وەرەقەکانی وەلانا. چاوێکی لە کوڕەکەی کرد و دوای تۆزیَ دوودڵی گوتی: «گنیا[9]، دەمویست شتێکت پیَ بڵێم. هەڵبەت من ئاگاداری هیچ شتێک نیم. تەنیا دەمەویَ داوات لیَ بکەم کە بەر لە زەماوەند کردن واز لە تەواوی هەڵسوکەوت و ماجەراکانی کاتی سەڵتیت بێنی و ئیتر بیری لیَ نەکەیتەوە و بە لایدا نەچیەوە، تاکوو هیچ شتێک نەیەتە پێشیَ کە ژیانی تۆ و ژنەکەت لێڵ بکات و تووشی ناڕەحەتی بن. خۆ لە مەبەستم تێدەگەی؟»

یۆڤگێنی ئیڤانۆڤیچ هەڵبەت لەڕێوە لە مەبەستی دایکی تێگەیشت و زانیی کە دایکی مەبەستی لەو قسانە کەینوبەینەکەی ئەو و ستپانیدایە کە لە پاییزی ڕابردووەوە کۆتایی هاتبوو. ئەو پێی وابوو دایکی وەک هەموو ژنانی بیَ مێرد گرنگایەتییەکی لەڕادە بەدەر بەو مەسەلەیە دەدا. یۆڤگێنی سوور هەڵگەڕا، بەڵام زیاتری سوور هەڵگەڕانەکەی بە هۆی تووڕەییەوە بوو نەک شەرم. لەوە ڕقی هەستابوو کە دایکە مێهرەبانەکەی، هەڵبەت لە ڕووی دڵسۆزییەوە، خۆ لە کارێک وەردەدا کە پێوەندیی بە ئەوەوە نییە و هیچی لیَ نازانیَ و ناتوانیَ تێی بگا.

---

٩- سووکەڵەناوی یۆڤگێنی

گوتی کە هیچ شتێک لە گۆڕێدا نییە کە پێویستیی بە شاردنەوە بێ و ئەو هەمیشە وای هەڵسوکەوت کردووە کە هیچ شتێک نەبێتە کۆسپ و لەمپەر لە سەر ڕێگای زەماوەندەکەی.

ماریا پاولۆڤنا تریق بۆوە و وەڵامی دایەوە: «چاکتر کوڕە خۆشەویستەکەم! تۆ نابێ لە من برەنجی و ئەو قسانەم بە دڵەوە بگری!»

بەڵام یۆڤگێنی دەیزانی نیگەرانییەکەی دایکی بەجێیە و چاکی بۆ چووە، پاشان ماریا پاولۆڤنا دوای ساتێک بێدەنگی، باسی کرد کە کاتێک ئەو لە ماڵێ نەبووە، بنەماڵەی پچلێنکۆڤ[10] هاتوون بۆ ماڵیان و داوایان لێکردووە ببێتە دایکەخێوی کۆرپەکەیان.

یۆڤگێنی دیسان سوور هەڵگەڕا. بەڵام ئەمجارەیان نەک لە شەرمانا بەڵکوو بە هۆی ڕق هەستانەوە، هەستێکی سەیر ... هەستی ئاگادار بوون لە بابەتێک کە تاوێک دواتر دەیبیست. هەستی ئاگادارییەکی بێ ئیختیارانە و بە پێچەوانە بەڵگە هێنانەوەکانی ئەو. ئەوەی چاوەڕوانی بوو ڕووی دا. ماریا پاولۆڤنا بە جۆرێک کە دەتگوت قەستی ئەوەیە گاڵتەوگەپ بکات گوتی نازانێ بۆچی ئەمساڵ ئەو منداڵانەی لە دایک دەبن، هەموو کوڕن. هەر دەڵێی جەنگمان لە پێشە، بنەماڵەی ڤاسین کوڕیان بووە و پچلێنکۆڤاش نۆبەرەکەی کوڕە. ماریا پاولۆڤنا دەیویست وا بنوێنێ کە هیچ مەبەستێکی لەو خەبەرانە نییە، بەڵام نەیتوانی و کە دیتی کوڕەکەی سوور هەڵگەڕاوە، بە شێوەیەکی پەشۆکاوانە چاویلکەکەی لە چاوی داماڵی و دیسان لە چاوی کردەوە و جگەرەیەکی داگیرساند. تریق بۆوە و ئەویش وەک کوڕەکەی

---

[10]- ماریانا پاولۆڤنا ناوی پچنێکۆڤی بە هەڵە بێژە کرد.

سوور هەڵگەڕا و بێدەنگ بوو. یۆڤگێنیش بێدەنگ بوو و ئەختوچاری کرد نەتیوانی قسەیەک بکات و ئەو بێدەنگییە بشکێنێ، هەردووکیان تێگەیشتن کە ڕازەکانیان ئاشکرا بووە و هیچیان نییە لە یەکتری بشارنەوە.

ـ بەڵێ، لە هەموو شتێک گرینگتر ئەوەیە لە گوندەکەدا یەکسانی جێ بکەوێ و جیاوازیی کچ و کوڕ نەمێنێ، نەک وەکوو مامت کە خۆشەویستیی بۆ هێندێک لە منداڵەکان دەردەبڕێ لەگەڵ هێندێکیشیان ساردوسڕە.

یۆڤگێنی لە ناکاو گوتی: «دایە گیان، من دەزانم مەبەستی تۆ لەو کینایەیە چییە، بەڵام خەمت نەبێ، نیگەرانییەکەت بێهۆیە. بنەماڵەی داهاتووی من زۆر بە لامەوە پیرۆزە. ئەوەندە پیرۆزە کە بە هیچ شێوەیەک ڕێگا نادەم پاکییەکەی ڕمووده بێ یان ڕێزەیەک غەور بگرێ. ئەگەر لە تافی لاویشدا هەڵەشەیی و لاڕێ بوونێک هەبووبێ، بە تەواوی کۆتایی پێ هاتووە و ئیتر وازم لێ هێناوە. من قەت قەت لەگەڵ هیچ کەس هیچ قەول و بەڵێنێکم نەبووە و هیچ کەسێک هەقی لە ئەستۆی من نییە.»

دایکی گوتی : «شوکر بۆ خودا! من لە تۆ و پاکی و حەیاکەت زۆر باش ئاگادارم و بڕوات پێدەکەم.»

یۆڤگێنی ئەو تاریفەی دایکی بە دڵ بوو و هیچ وەڵامێکی نەدایەوە.

ڕۆژی دوایی بەیانی زوو چوو بۆ شار، مێشکیشی پڕ لە خەیاڵی دەزگیرانەکەی بوو. بیری لە هەموو شت دەکردەوە جگە لە ستپانیدا. مەگین دەستی قەزا وەبیری بهێنایەتەوە. ڕێگای کلیسای گرتە بەر و لەگەڵ خەڵکانی سوارە و پیادە بەرەوڕوو بوو کە لەولاوە دەهاتن.

ماتڤێی[11] پیری دی لەگەڵ سیمۆن و دەستەیەک منداڵان و کچانی جحێڵ. بەڵام دواتر تووشی دوو ژن بوو، یەکیان پیر و ئەوی دیکەیان جوان و ڕازاوە، لەچکەیەکی سووری بریقەداری بە سەردا دابوو، بەژنوباڵای لە کەسێکی ناسیاو دەچوو. گورج و خێراخێرا هەنگاوی دەنا و منداڵێکی بە باوەشەوە بوو. کاتێک گەیشتە لایان پیرێژنەکە بە شێوەی پێشینیان سڵاوی کرد و ڕاوەستا، ژنە جحێڵەکەش کە منداڵی بە باوەشەوە بوو، تەنیا سەری دانەواند و چاوە پڕ بزەکانی لە ژێر لەچکە سوورەکەیدا درەوشانەوە. تروووسکەیەکی پڕ لە جوانی و نەشە لە ڕوخساریدا شەپۆلی دا.

بەڵێ، خۆی بوو؛ بەڵام چبکا، کەینوبەینەکەیان کۆتایی پێ هاتبوو، چاو لێکردنیشی ئیتر نەشیاو بوو. بیرێک وەک برووسکە بە مێشکیدا هات کە ئەو کۆرپەیە ڕەنگە هی ئەو بێ. بەڵام نا، ئەوە چ قسەیەکە! حەتمەن مێردەکەی هاتۆتەوە و پێکەوە بوون. تەنانەت نەیدەویست حیسابیشی بکات کە ماوەی چەند مانگ پێکەوە بوون و منداڵ بە چەند مانگ لە دایک دەبێ. کڵاوی خۆی کردبووە قازی و وای بە خۆی سەلماندبوو کە بۆ تەندروستیی باش و پێویستە و پارەی داوە بەو ژنە و ئیتر تەواو و بڕایەوە. ئیتر بۆ ئەوە نەدەبوو خۆی پێوە ماندوو بکات، لە نێوان ئەو ژنەشدا هیچ بەند و پێوەندێک نەبوو. هیچ کاتیش نەبووە و ناکرێ بووبێ و ناشبێ بووبێ. تەنانەت بە پێویستی نەدەزانی هاواری ویژدانی خۆی کپ بکات. نا، ویژدانی هیچی بە گوێدا نەدەچرپاند و ئەویش دوای ئاخافتن لەگەڵ دایکی، ئیتر تەنانەت بۆ جارێکیش بیری لە ستپانیدا و ژوانەکانی نەکردبۆوە. ژوانەکانیان

---

11- Matvyey

تەواو بووبوو و چەند مانگ بوو تەنانەت بۆ تاقەجارێکیش یەکتریان نەدیبوو.

یۆڤگێنی حەوتوویەک دوای جێژنی پاک لە شار زەماوەندی کرد و لەرێوە لەگەڵ هاوسەری گەڕانەوە بۆ گوند. ماڵەکە بە پێی پێویست بۆ بووک و زاوا ڕازێندرابۆوە و هەموو شتێک ڕێکوپێک کرابوو. ماریا پاولۆڤنا دەیویست ماڵەکەیان بۆ بەجێ بێڵێ و بڕوا، بەڵام یۆڤگێنی و لەویش زیاتر لیزا، لەسەر ئەوە پێداگر بوون کە بمێنێتەوە و بەجێیان نەهێڵــێ. ئەو لەوێ مـــایەوە، بەڵام کەلوپەلەکـــانی گوێســـتەوە بـــۆ خانوویەکی تەنیشت دیوەخانەکە.

بەم شێوەیە ژیانی نوێی یۆڤگێنی دەستی پێکرد.

# حەوت

یەکەم ساڵی پێکهێنانی ژیانی هاوبەشی بۆ یۆڤگێنی زۆر ساڵێکی دژوار بـــوو، دژوارییەکەشـــی ئەوە بـــوو: ئەو کـــارانەی وا لە کـــاتی دەزگیرانداریـــدا وەدوای خســـتبوون، ئێســـتا دوای زەماوەنـــد کردنـــی، هەموویان بە سەریدا ڕژابوون.

هێشـــتا لە ژێـــر بـــاری قەرزوقـــۆڵە نەهـــاتبووە دەرێ، مـــاڵێکی هـاوینەهەواری بـوو فرۆشـتبووی و قەرزە بەپەلەکـانی دابـۆوە. بەڵام هێشتا قەرزێکی زۆری لە سەر مابوو و گیرفانی هەڵتەکابوو. داهـاتی مڵکەکەی خراپ نەبوو، بەڵام دەبوو پارە بۆ براکەی بنێرێ و خەرج و قەرزی زەماوەندەکەشی پاکتاو بکات، لە لایەکیشەوە ئەو پارەیەی بۆ پاشـەکەوت ڕایگرتبـوو، ئەویش گسکی لێدرابوو. کارخانەکەشـی بـۆ هەڵنەدەســـووڕا و ناچـــار بـــوو بیخەوێنـــێ. بـــۆ دەربـــاز بـــوون لەو تەنگژەیەش تەنیا ڕێگایەکی بۆ مابۆوە و ئەویش کەڵک وەرگرتن لە پـــارەی هاوســـەرەکەی بـــوو. لیـــزا کە لەو کێشـــە و گـــرفتە مـــاڵییەی مێـــردەکەی ئاگـــادار بـــوو خـــۆی داوای لێکـــرد پـــارەکەی هەڵگـــرێ و کێشەکانی پێ چارەسەر بکات. یۆڤگێنی بۆ ئەو کارە ڕازی بوو بەڵام بەو شـەرتەی نیوەی مڵکەکەی بکـات بە نـاوی ژنەکەیەوە. ئەو کـارەی کـرد بەڵام نەک لەبەر ئەوەی دڵـی ژنەکەی ڕاگـرێ و لێـی زیـز نەبـێ، بەڵکوو لەبەر بەستنی زمانی خەسووی.

ئەو کـــارانە هاوکـــات لەگەڵ هەوراز و نشـــێوی جۆراوجـــۆر و سەرکەوتن و شکستی پەیتا پەیتا، خۆی یەکێک لەو هۆکارانە بوو کە یەکەم ســاڵی ژیــانی هاوبەشــی یــۆڤگێنی زۆر دژوار بــێ. هۆکــاری دووهەمیش نەخۆشیی لیزا بوو. پاییزی یەکەم ساڵ یانی حەوت مانگ دوای زەماوەنـدەکەیان ڕووداوێکـی خـراپ بـۆ لیـزا هـاتە پێشـێ. بە عارەبانەیەک چـوو بۆ پێشـوازیی مێردەکەی کە لە شـار دەگەڕایەوە. کەچی ئەو بارگینەی لە عارەبانەکە کرابوو، ئەگەرچی بارگینێکی زۆر ئـارام بـوو، لە ناکـاو بەلەســە دەبـێ و دەسـت دەکـا بە سـمکۆڵ و چەپۆکان و لیزا لە ترسـانا باز دەداتە خوارێ. ئەو بازدانەش بە خێر گوزەرا و لەوانە بوو داوێنی کراسەکەی لە تایەی عارەبانەکە بگیرێ و ڕووداوێکـی دڵـتەزێن بقەومـێ. ئەو دووگیـان بـوو، ئەو شـەوە ژان گرتی و منداڵەکەی لە بار چوو. هەتا ماوەیەکی زۆر دوای ڕووداوەکە نەیتـوانی لەشسـاغیی خـۆی بە دەسـت بێنێـتەوە. لە دەسـت دانـی کــۆرپەیەک کە هەمــووان بە تــامەزۆرییەوە چــاوەڕوانی بــوون و لەشبەباریی لیزا و ئاڵۆزیی ژیانیان کە دەردی سەرباری دەردان بوو هەمـووی بە جێـی خـۆی، هـاتنی خەسووشـی کە لە کـاتی نەخۆشـیی لیزاوە لەوێ دایکوتـابوو، ژیـانی لە یۆڤگێنی تـاڵ کردبوو. ئەم هەمـوو گرفت و تەنگژانە بە سەریدا ڕژابوون و یەکەم ساڵی پێکهێنـانی ژیانی هاوبەشییان لێ کرد بە ژەقنەمووت.

بەڵام یۆڤگێنی سەرەڕای هەموو ئەو کۆسـپ و تەگەرانە لە کۆتـایی ساڵدا هەستێکی خۆش باوەشـی لە ڕۆحی وەرهێنا. گەڕانەوەی ئـاوی ڕۆیشتوو بە جۆگەدا و ژیاندنەوەی پلان و کارەکانی باوەگەورەی بە شـێوەیەکی نـوێ، ئەگەرچـی زۆر بە شـێنەیی و بە دژواری بەڕێـوە دەچـوو. ئێسـتا ئیتـر بـۆ پاکتـاوی حیسـاب و دانەوەی قەرز بـاس لە

فرۆشتنی ملْک نەدەکرا. ملْکی سەرەکی، کە بەشێکی بە ناوی لیزا تاپۆ کرابوو، ئیتر لە مەترسی خەلەستبوو و ئەگەر داهاتی چەوەندەریش باش بوایە و نرخەکان لە بار بوایەن، ساڵی داهاتوو کەمایەسییەکان قەرەبوو دەکرانەوە و تەنگانە جێی خۆی دەدا بە فەرعانە! خاڵێکی تر ئەوە بوو ئەگەرچی یۆڤگێنی چاوەڕوانییەکی زۆری لە ژنەکەی بوو، بەڵام ئەوەی لەودا دەیدی تووشی سەرسووڕمانی دەکرد چونکە خسڵەت و ئاوەزی ئەو زۆر زیاتر لەوە بوو کە بیری لێدەکردەوە. هەرچی هەوڵی دەدا خۆشەویستی و ئەوینێکی پڕ سۆز لە نێوان خۆی و هاوسەرەکەیدا پێکبێنێ، سەرکەوتوو نەدەبوو، یان سەرکەوتنەکەی وەبەرچاو نەدەهات. بە پێچەوانە شتێکی تر لە نێوانیاندا سەری هەڵدەدا، شتێک کە نە هەر دەبوو هۆی شادی و خۆشەویستی زیاتر بوو بەڵکوو ژیانیشی بۆ ساناتر دەکردن. ئەوەش تەنانەت یۆڤگێنی خۆشی نەیدەزانی چۆن سەری هەڵداوە و ئاوێتەی ژیانیان بووە. ئەمەش باوەڕ و متمانەیەک بوو کە لیزا دوای زەماوەندەکەیان پێی گەیشتبوو، ئەو لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە مێردەکەی مەزنترین و ئاوەزمەندترین و پاکترین و بەحەیاترین پیاوی دنیایە. شیرهاو. لە ئاکامدا هەمووان دەبێ بە ئەرکی سەر شانی خۆیانی بزانن کە ڕێزی بۆ دانێن و بە ئاغای خۆیانی بزانن و دڵی ئەو ئیرتنیڤە لاوە ڕاگرن. بەڵام چنکە نەیدەتوانی هەمووان ب ئەو کارانە ڕازی بکات و ناچاریان بکات ئەو جۆرەی شیاوی گەورەیی ئەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەن، بە ئەرکی خۆی دەزانی کە هەتا ئەو جێیەی لە توانایدایە و لە دەستی دێ کەمتەرخەمیی دەوروبەرییەکان قەرەبوو بکاتەوە و ئەرکی ڕێزدانان و ڕازی کردن و بە گەورە زانینی ئەو بگرێتە ئەستۆ. جگە لەوە بیری لە هیچ شتێکی تر نەدەکردەوە و تەواوی توانا و بیر و ڕۆحی خۆی بۆ ئەو کارە تەرخان کردبوو کە بزانێ و تێبگا

مێـردەکەی حەزی لە چییـە و بە چـی دڵخـۆش دەبـێ کە ئەو قـۆڵی لـێ هەڵماڵێ و بەڕێوەی بەرێ. ئەگەر دژوارترین کاریش بێ. لیزا خاوەنی خیسڵەت و خدەیەک بوو کە باڵاترین هاودڵی و هـاودەم بـوون لەگەڵ ژن و گـراوی خۆشەویسـت لەودا هەیە. بە هـۆی ئەشـقی مێـردەکەیەوە کە ڕۆح و گیانی لەگەڵی بوو، دەروویەک بەرەو ڕۆح و دەروونـی کرابۆوە و ڕۆحی ئەو وەک ئاوێنەیەکی لێ هاتبوو کە هەموو جوانی و خۆشییەکانی دنیـای تێـدا دەدی. یـۆڤگێنی دەیـدی کە ژنەکەی هەمـوو بـارێکی ڕۆح و خـدەی تێـدەگات و سـەر بە هەمـوو سـووچ و قوژبنەکـانی دڵ و گیانیـدا دەکات و بە هەستی تیژ و وردبینـانەی تـایبەت، بە خۆی زیاتر لە ڕۆح و خولیا و حەزەکـانی تێدەگات و بە دڵـی ئەو دەجـووڵێتەوە. دەیزانـی هـیچ شتێک نابێتە هۆی ڕەنجاندن و گەرد گرتنی دڵی و تەمی هەستە تاڵ و ناخۆشـەکانی دەڕەوێنـێ و کانیـاوی چێـژ و شـیرینایییەکانی ژیـانی پـڕ قوڵپەتر دەکات. بەڵام ئەو تایبەتمەندییانەی تەنیا لە چوارچێوەی هەستدا نەبوو، بەڵکوو لە بیر و خەیاڵەکانیشی تێدەگەیشت. تەنانەت لە کاروبـاری کارخـانە و کشتوکاڵیشـدا کە هـیچ شـارەزاییەکی نەبـوو، بە تەگبیـر کـردن یارمەتیی دەدا و سەری لێی دەردەچوو، یـان بۆ هەڵسـەنگاندن و داوەری کـردن لە سـەر کەسـانی دەوروبەریـان کە یـۆڤگێنی خـۆی هێنـدێ جـار دادەما و زۆری بە لاوە ئەستەم بوو، لیزا یـارمەتیی دەدا و لەو بـارەیەوە دەکەوتنە گفتوگۆ و بە هاوکـاریی یەکتـر گرفتەکەیـان چارەسـەر دەکـرد، بـۆیە یـۆڤگێنی دەیگـوت ئەو بـۆ مـن ڕاوێژکـارێکی زۆر بەکەڵـک و بـێ وێـــنەیە. ئەو هەمـــوو کاروبارەکـــان و کەســـانی دەوروبەریـــان و پێداویستییەکانی ژیانیانی لە چاوی مێردەکەیەوە دەدی. دایکی خـۆی زۆر خۆش دەویست بەڵام کاتێک بـۆی دەرکەوت بە خـۆ تێوەردان لە ژیانیـان دڵـی مێـردەکەی شـلوێ دەکـات، لەڕێـوە لایەنـی مێـردەکەی دەگـرت و

ئەوەنـدە لێبـڕاوانە دەمـی لە دایکـی هەڵـدەماڵی کە یـۆڤگێنی هەوڵـی دەدا هێوری بکاتەوە.

جگە لەوانەش لیـزا ژنێکـی زۆر بەسـەلیقە و وردبـین بـوو، لە هەمـوو ئەوانەش گرینگتـر زۆر نەرمونیـان و لەسـەرەخۆ بـوو. ئەو کارەکـانی بە جۆرێک بەڕێوە دەبرد کە هیچ کەس پێی نەدەزانـی و تەنیـا ئاکامەکەی بە دیـار دەکەوت، ئەویـش ڕێکـوپێکی و پاکوخـاوێنی و ڕازاوەیـی بـوو. لیـزا زۆر زوو تێگەیشـتبوو کە ئامـانجی مێـردەکەی لە ژیانـدا چییە و هەوڵـی دەدا ڕێکخسـتن و بەڕێـوە بردنـی کاروبـاری نێومـاڵ بە پێـی ویسـتی ئەو بێ. ئەوەی دەبووە هـۆی بەختەوەریـی ئەوان لە ژیانـدا، تەنیا منداڵ بـوو کە بە داخەوە تا ئەو کاتە لێی بێبەش بوون. بەڵام لێرەشـدا دەرووی هیـوا دانەخرابـوو، زسـتان چووبـوون بـۆ لای مامانێـک لە پترزبـۆرگ و ئەو دڵنیـای کردبـوو کە لیـزا تەندروسـتیی زۆر باشـە و بەبـێ هـیچ گرفتێـک دەتوانێ منداڵی ببێ.

ئەم ئاواتەشیان هـاتە دی و لیـزا لە کۆتـایی سـاڵدا زگـی پڕ بـوو. تەنیـا شـتێک کە بەختەوەرییەکەیـانی ئەگەر نەڵێین دەشـێواند، لانـیکەم دەکـرێ بڵێین هەڕەشـەی لێدەکرد، دڵپیسـی کردنی لیزا بوو. لیـزا زۆری هەوڵ دەدا ئەو ئێرەیی بردنە هێور کاتەوە یان لانیکەم بیشـارێتەوە، بەڵام نەیدەتوانی و ئەوەش زۆری ئـازار دەدا... بە بـڕوای ئەو، یـۆڤگێنی نەیـدەتوانی هـیچ ژنێکی خۆش بوێ چونکە هیچ ژنێک لە دنیادا شایانی ئەوە نەبوو لە دڵـی یۆڤگێنیدا جێ بکـاتەوە (هەڵـبەت ئەوەی کە خـۆی شـایانی خۆشەویسـتیی ئەو بوو یان نا، مەسەلەیک بوو کە هیچ کـات گرینگیی پێ نەدەدا) و هـیچ ژنێکیش نەدەبوو ڕێگا بە خۆی بدا کە ئەوی خۆش بوێ.

# هەشت

بەرنامەی ڕۆژانەیان بەم شێوەیە بوو: یۆڤگێنی هەمیشە بەیانیان زوو لە خەو هەڵدەستا و دەچوو بە لای کاروبای مەزراوە، یان بە سەر کارخانەکەدا ڕادەگەیشت کە ئێستا دەستبەکار بووبۆوە. یان هێندێ جار دەڕۆیشت بۆ سەحرا. کاتژمێر دەی بەیانی بۆ خواردنەوەی قاوە دەگەڕایەوە بۆ ماڵێ. لەگەڵ ماریا پاولۆڤنا و لیزا و مامە پیرەکەی کە ئێستا لەگەڵ ئەوان دەژیا، لە بەرهەیوان دادەنیشتن و قاوەیان دەخواردەوە. دوای ماوەیەک دەمەتەقێ، کە زۆر جار ئاخافتنەکەیان زۆر گەرموگوڕ دەبوو، هەرکەس دەچوو بە دوای کاری خۆیدا هەتا کاتی فراوێن. سەعات دووی دوانیوەڕۆ بۆ خواردنی نان و چای نیوەڕۆ کۆ دەبوونەوە و پاشان هێندێک لە نێو باخەکەدا پیاسەیان دەکرد، یان بە سواری فایتوون دەچوون بۆ گەشت و گەڕان. ئێوارانیش یۆڤگێنی بە دەنگی بەرز کتێبی دەخوێندەوە. لیزاش ئەگەر دروومانێک ببوایە جێبەجێی دەکرد، ئەگەر نەبوایە، دەچووە پشت پیانۆکە و مۆسیقای دەژەنی، ئەگەر میوانیشیان بۆ بهاتبایە، لەگەڵی دادەنیشتن و دەستیان دەکرد بە ئاخافتن. هەرکاتێک کە یۆڤگێنی بۆ جێبەجێ کردنی کارێک دەچوو بۆ سەفەر، هەموو ڕۆژێ نامەیەکی بۆ ژنەکەی دەنووسی و ئەویش وەڵامێکی بۆ دەناردەوە. هێندێ جار لیزا لەگەڵی دەچوو بۆ سەفەر و لەو کاتانە هەردووکیان دڵخۆش بوون بە خۆشی ڕایاندەبوارد. لە

ڕۆژانی جێژنی سێ پیرۆزاندا[12] میوانی و بەزم و ئاهەنگیان سار دەکرد و یۆڤگێنی زۆر دڵخۆش بوو کە دەیدی ژنەکەی ئەو ڕێورەسمانە ئاوا بە ڕێکوپێکی و کارزانییەوە بەڕێوە دەبا و دەبێتە هۆی ئەوەی هەمووان شاد و دڵخۆش بن. دەیدی و دەیبیست کە هەمووان بە چاوی ڕێزەوە دەڕواننە خاتوونی ماڵێ و ئافەرینی پێ دەڵێن و ئەوەش ئەوەندەی تر ئەشق و خۆشەویستی ئەوی لە دڵیدا بەتین دەکرد. هەموو شتێک بە خۆشی و شادی بەڕێوە دەچوو. لیزا ماوەی دووگیانییەکەی بە سانایی تێپەڕ کرد و هەردووکیان سەرەڕای هێندێ شەرم و شکۆ دەستیان کرد بە قسە کردن و تەگبیر و ڕا سەبارەت بە پەروەردە و بارهێنانی منداڵی داهاتوویان. باسی شێوەی گەورە کردنی کۆرپە و ئەو کارانەیان دەکرد کە بۆ منداڵێکی ساوا پێویستە. یۆڤگێنی کات و شوێنی دیاری دەکرد بەڵام لیزا حەزی دەکرد لە هەموو کارێکدا سەر لە پێناوی ئەو بێ و بە پێی ویست و بۆچوونەکانی ئەو هەستێ و دانیشێ و لە قسەی دەرنەچێ. یۆڤگێنی کتێبی پزیشکیی دەخوێندەوە و دەیویست منداڵەکەیان بە پێی بنەما زانستییەکان گەورە بکات و لیزاش هەموو قسەکانی ئەوی بە دڵ و گیان وەردەگرت، بۆ هەموو کارێکیش ئامادە بوو. پەڕۆوپاڵی بۆ مەلۆتکە کردنی ساواکەیان دەدووری و بێشکەی بۆ بە دروست کردن دابوو. ساڵی دووهەمی ژیانی هاوبەشی و دووهەمین بەهاری پێکەوە بوونیان بەم شێوەیە دەست پێکرد.

---

١٢- جێژنی تەسلیس واتە سیانە (باوک و کوڕ و ڕۆحی پیرۆز)

# نــۆ

زۆری نەمابوو بۆ یەکشەممەی سێ پیرۆزان. لیزا پێنج مانگ بوو دووگیان بوو، ئەگەرچی دەبوو زۆر ئاگاداری خۆی بێ بەڵام زۆر چالاک و بەنەشە بوو. دایکی خۆی و خەسووی هەردووکیان بە بیانووی ئاگادارییەوە میوانی بوون و بە تیز و فڕ و لاتاو و ناونیتکە لە یەک هەڵدان بووبوونە هۆی خەفەت و دڵتەنگی بۆی و بە جارێ وەڕەزیان کردبوو. یۆڤگێنی زۆر سەرقاڵ و گرفتاری کار بوو و خەریکی تاقیکردنەوەی گەلاڵەیەکی بەربڵاو و نوێ بوو بۆ داچاندنی چەوەندەر.

هەر لەو سەروبەندەدا لیزا بڕیاری دا ماڵ هەڵگرێ و هەموو ژوور و کەلوپەلەکانی بخاتە دەرێ و خاوێنیان بکاتەوە. ئەوەش کارێک بوو کە لە جێژنی پاکەوە نەیکردبوو. دوو ژنی گوندنشینی بە کرێ گرت کە بۆ شۆردنەوەی تەرکی ژوورەکان و پەنجەرە و تەکاندنی فەرش و قەنەفەکان و ڕاخستنەوەی ژوورەکان یارمەتیی خزمەتکارەکان بدەن. ژنەکان لە بەیانی زووەوە هاتن و دوو مەنجەڵی گەورەیان نایە سەر ئاور و دەستیان کرد بە کار کردن. یەکێک لەو ژنانە ستپانیدا بوو کە تازە منداڵەکەی لە شیر بڕیبۆوە. لە ڕێگای بەڕێوەبەری نووسینگەی ئاغاوە کە ئێستا دڵداری بوو، داوای کاری کردبوو و هەروەها دەیویست خێزانی ئاغاش لە نزیکەوە ببینێ. ئەو وەک هەمیشە تەنیا بوو، چونکە چاوی مێردەکەی بە سەرەوە نەبوو بە

کەیفی خۆی ڕایدەدا و بەرگێڕەوەی نەبوو. ئەو لە ڕابردوودا لەگەڵ دانیلای پیر تێکەڵاویی هەبوو و دانیلا ڕۆژێک کاتی کۆکردنەوەی ئێزنگ لە نێو دارستانەکە کەوتبووە داوی ستپانیدا و هەتا ئەو کاتەی دانیلا، یۆڤگێنی بۆ خستە تۆڕەوە، بەردەوام هاتوچۆی ماڵۆچکە جەنگەڵییەکەی ئەوی دەکرد. ئێستاش کە ئاغا لێی کشابۆوە، ئەو گەنجەی نووسینگەکەی ئاغای لە داو خستبوو. ئیتر بیری لە پێوەندیی لەگەڵ ئاغا نەدەکردەوە. چونکە دەیزانی ئێستا ئاغا ژنی هەیە. بە خۆی دەگوت کە ئاغا ئیتر کەڵەبابی خۆی بە لەپەوە لێناوە و ئاوڕ لە من ناداتەوە. بەڵام زۆری حەز دەکرد ژنەکەی ئاغا ببینێ و بیستبووی کە ماڵ و ژیانەکەی زۆر خاوێن و ڕێکوپێک و ڕازاوەیە.

یۆڤگێنی لەو ڕۆژەوە کە لە ڕێگا تووشی ستپانیدا بووبوو، مندالّکێی بە باوەشەوەیە، ئیتر چاوی پێی نەکەوتبوو. ستپانیدا بە هۆی منداڵەبەرییەوە نەدەچوو بۆ کار و ئاغاش زۆر بە دەگمەن ڕێی دەکەوتە گوندەکە. یۆڤگێنی ئەو ڕۆژە کە شەوەکەی جێژنی سێ پیرۆزان بوو، بەیانی زوو، کاتژمێر پێنج لە خەو هەستا و ڕۆیشت بۆ مەزرا. چوو بۆ لای زەوییەک کە دەبوو فوسفاتی پێوە کا و کاتێک لە ماڵێ هاتە دەرێ، هێشتا ژنەکان نەهاتبوونە ژوورێ و خەریکی وەجاخ و مەنجەڵەکان بوون.

یۆڤگێنی شاد و دڵخۆش و ڕازی لە کاری سەرلەبەیانی خۆی، برسی و ماندوو بۆ خواردنی ناشتایی گەڕایەوە بۆ ماڵێ. لە دەرەوەی باخەکە لە ئەسپەکەی دابەزی، دایە دەست باخەوانێک کە لەوێوە تێدەپەڕی، لەگەڵ ئەوەی بە خەرەزەنگەکەی لە گیاوگژی قەراغ توولەڕێکەی ڕادەکێشا، ئەو ڕستەیەی کە لە مەزرا کەوتبووە سەر زمانی، هەروەک چۆن جاری وایە بۆ هەمووان پێش دێ کە شتێک

دەکەوێتە سەر زمانیان و بێ ئیتخیار دووپاتی دەکەنەوە، لە ژێر لێوەوە بە ورتەورت و دووپات کردنەوە خۆی کرد بە ژووریدا. ڕستەکەش ئەمە بوو: «فۆسفات پاکانە دەکا.»

ئەگەر لەو کاتەدا لێت بپرسیبایە فۆسفات چ شتێک و بۆ چ کەسانێک پاکانە دەکا، هیچ وەڵامێکی نەبوو بیداتەوە و بیریشی لێ نەدەکردەوە.

خزمەتکارەکان قەنەفەکانیان هێنابووە دەرێ و لە سەر چیمەنەکە خەریکی تەکاندنی فەرشەکان بوون.

لە بەرخۆیەوە دەیگوت: «پەککوو دایکیلەکان! لیزا چ ماڵێک خاوێن دەکاتەوە! ... فۆسفات پاکانە دەکا ... بەوە دەڵێن کەیبانوو ... بەڵێ، چ کەیبانوویەکی شیرینە! چ کەیبانوویەکی بێ وێنەیە!..» لیزای بە ڕبدوشامبرێکی سپییەوە هێنایە بەرچاوی خۆی، بە ڕوخسارێکی پڕ ترووسکە و شاد و لێوی بە پێکەنین پشکووتووەوە، بە جۆرێک کە هەرکاتێ دەیدی دەموچاوی بەو شێوەیە بوو. «بەڵێ، دەبێ جزمەکانم داکەنم و هەڵبەت فۆسفات پاکانە دەکا... چونکە ۆنی پەینی لێ دێ. خاتوونەکەی من بەو زگپڕیەوە ئەو بۆنەی بە سەردا بچێ دڵی تێکەڵ دێ...» لە دڵی خۆیدا گوتی: «باشە زگی بۆ ئاوا هەڵمساوە؟ چونکە یەک ئیرنیتیڤی چکۆلە خەریکە لە نێویدا گەورە دەبێ. بەڵێ، فۆسفات پاکانە دەکا!» بەو بیر و خەیاڵانەوە بە لێوی بزە تێزاوەوە دەستی برد بۆ دەسکی دەرگای ژوورەکەی خۆی و ویستی بیکاتەوە، بەڵام فریا نەکەوت پاڵی پێوەنێ دەرگاکە بۆخۆی کرایەوە و ژنێکی پەلوپووز ڕووت کە سەتڵێکی بە دەستەوە بوو و داوێنی کراسەکەی بە لادا کردبوو و قۆڵی هەڵماڵیبوو، لە ژوورەکە هاتە دەرێ و لە نێو دەرگاکەدا لووتیان بە لووتی یەکدا تەقی. خۆی لادا کە ژنە بێتە دەرێ

بەڵام ژنەش خـۆی دا پەنـا دیـوارەکە و بە پشــتی دەســتە تەڕەکەی، لەچکەکەی سەری ڕێکوپێک کرد.

یۆڤگێنی گوتی: «وەرە دەرێ من نایەمە ژووریێ هەتا تۆ...» لەپڕ ناسییەوە و بێدەنگ بوو. ستپانیدا بە چاوانی گەش و لێوی پڕ بزەوە چاوێکی لێکرد و داوێنی کراسەکەی بەردایەوە و بەپەلە هاتە دەرێ.

یـۆڤگێنی بە نێوچـاوانێکی گـرژەوە دەسـتی هەڵتەکانـد وەک ئەوەی مێشـێک لە خـۆی دەرکـا، دڵـی کەوتە کوتەکـوت و خەمێـک خـۆی بە ناخیدا کرد، چونکە هەستی کـرد ئەو دیـدارە سـەرنجی ڕاکێشـاوە ... لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەوە یانی چی؟ شتی وا هەر نابێ! باشە ئەمە لێرە چ دەکا؟ شتی وا هەر نابێ! ...» لەوە دڵتەنگ بوو کە سـەرنجی دابوو، لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانیبوو چاوپۆشی لەو بەژنە لەبارەی و هەنگاوی گورج و پەلوپووزی ناسک و لەرەی سینگ و گۆڵمەڕانی بکات و ئەو قـۆڵ و مەچەکە سپیوسـۆڵەی و شـان و ملـی نەرم و چینـی کـراس و داوێنی بەلاداکراوی نەبینێ.

سەری داخست کە ئیتر نەیبینێ و لە دڵی خۆیدا گوتی: «من چاو لە چی دەکەم؟ ... من دەبێ بچم جزمەکانم بگۆڕم! ...» وەرسـووڕا و گەڕایەوە بـۆ ژووریێ. بەڵام هێشــتا هەنگــاوێکی هەڵنەهێنــابۆوە بــێ ئەوەی خۆشــی بزانــێ چـۆن، وەک ئەوەی کەسـێک فەرمـانی پێـدابێ، ئاوڕی دایەوە تاکوو جارێکی تر ببینێ. دیتی ستپانیداش کە خەریک بوو لە سـووچی دیوارێک ئـاوا دەبـوو، ڕاسـت لەو چـرکەیەدا ئـاوڕی دایەوە و لە ئەوی ڕوانی.

یۆڤگێنی لە دڵی خۆیدا هـاواری لـێ هەسـتا: «ئەوە چ دەکەی؟! ئەی ئەوە دەبێ چۆن بیر بکاتەوە؟ حەتمەن هەتـا ئێسـتا هەزار جۆر بیـر و خەیاڵی لە لای خۆی ڕستووە!»

پێی نایە نێو ژوورەکەوە کە تەرکەکەی خووسابوو. ژنێکی تر پیر و لاواز، خەریکی شتنەوەی تەرکی ژوورەکە بوو. یۆڤگێنی لە سەر پەنجەی پێ بە نێو چڵکاوی کۆوەبووی تەرکی ژوورەکەدا تێپەڕی و چوو بۆ بن دیوارەکە کە جزمەکانی لەوێ بوون، دەیویست بێتە دەرێ کە پیرێژن لە ژوورەکە چووە دەرێ.

دەنگێک لە ناکاو لە مێشکیدا دەستی کرد بە بەڵگە هێنانەوە: «ئەمەیان ڕۆیشت، ئێستا ئەوی دیکەیان، ستپانیدا دەگەڕێتەوە و تەنیا!»

لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «خودایە گیان، ئەمانە چ بیر و خەیاڵێکن لە مێشکمدا! من چبکەم؟!» جزمەکانی هەڵگرت و بەپەلە لە ژوورەکەوە ڕۆیشت بۆ دیوی جلان. لەوێ جزمەکانی لە پێ کرد و دەستێکی بە سەروچاوی خۆیدا هێنا و چوو بۆ بەرهەیوانەکە. دایکی لەگەڵ خەسووی خەریکی خواردنەوەی قاوە بوون. لیزا کە چاوەڕوانی ئەو بوو هاوکات لەگەڵ ئەو لە دەرگایەکی دیکەوە هات بۆ بەرهەیوانەکە.

یۆڤگێنی لە دڵی خۆیدا گوتی: «خودایە، ئەگەر ئەو، کە من بە پیاوێکی ئەوەندە پاک و بەشەرەف و بێتاوان دەزانێ، ئەگەر بزانێ ...!»

لیزا بە ڕوخسارێکی گەشاوە و لێوی پڕ بزەوە هات بەرەوپیری. بەڵام ئەمرۆ مێردەکەی زۆر لاواز و زەردەڵ و ڕەنگ بزرکار هاتە بەرچاو.

# ده

له کاتی خواردنەوەی قاوەدا، باسێک هاتە گۆڕێ کە هەروەک زۆر جار دێتە پێشێ لە نێوان ژناندا ئەو جۆرە قسانەی کە تایبەتی خۆیانە و هیچ پێوەندییەکی بیرسایی پێوە دیار نییە، بەڵام لە ڕواڵەتدا زنجیرئاسا پێکەوە گرێ دراوە، چونکە بەردەوام درێژەی پێ دەدرێ.

ئەو دوو خاتوونە بە تیز و کینایە کەوتنە گیان یەک و لیزا هەوڵی دەدا لە نێوان ئەو تیرانەدا کە ئاوقای یەکتریان دەکرد، بە شارەزاییەوە خۆی ڕزگار بکات.

لیزا بە مێردەکەی گوت: «زۆر بە داخەوەم کە فریا نەکەوتین بەر لە هاتنەوەت، شۆردنەوەی ژوورەکەت تەواو بکەین. بەڵام من زۆرم حەز دەکرد کە هەموو شتێک بە ڕێکوپێکی لە جێی خۆی داندرێتەوە.»

ـ تۆ توانیت دوای ڕۆیشتنی من تۆزێ پشوو بدەی؟

ـ بەڵێ، زۆر چاک خەوتم، ئێستا حاڵم زۆر باشە.

ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنا دایکی لیزا گوتی: «حاڵی ژنێکی دووگیان لەم دۆزەخەدا چۆن دەبێ باش بێ؟ ئەویش لەو ژوورەدا کە پەنجەرەکانی ڕوو لە خۆرن و پەردەیەکیان پێوە نییە! لە ماڵی ئێمە پەنجەرەکان هەموویان پەردەی هەتاوگیریان پێوەیە.»

ماریا پاولۆڤنا گوتی: «بەڵام ئێرە لە کاتژمێر دەی بەیانییەوە سێبەرە!»

ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنا بەبێ ئەوەی لە دژوازیی قسەکانی خۆی ئاگادار بێ وەڵامی دایەوە: «ئاکامەکەشی تاویاوە. شێداریی هەوا لەوەوە سەرچاوە دەگرێ. پزیشکەکەی من هەمیشە دەڵێ هەتا سروشتی ناتەندروست نەناسی، دۆینەوەی نەخۆشی مەحاڵە. ئەویش دەزانێ چی دەڵێ. چونکە باشترین پزیشکە. ئێمە هەموو جارێ سەد ڕۆبڵی ویزیت پێ دەدەین. خوالێخۆشبوو مێردەکەم بڕوای بە پزیشک و دەوا و دەرمان نەبوو، بەڵام بۆ من، هیچ کات بۆ هیچ شتێک درێغیی نەدەکرد.»

ـ چۆن دەکرێ پیاوێک کە لەشساغی ژن و منداڵەکانی لە گۆڕێدا بێ، کەمتەرخەمی بنوێنێ و درێغی بکات!

ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنا گوتی: بەڵێ، هەڵبەت کاتێک ژن خۆی پارەی هەبێ، هیچ پێویستییەکی بە مێرد نییە و نابێ لارەمل بژی. بەڵام ئەوەشمان لە بیر نەچێ، ژنی باش دەبێ هەمیشە سەر لە پێناوی مێرد بێ. کێشەکە لێرەدایە کە لیزا دوای نەخۆشییەکەی زۆر لاواز و بێهێز بووە.»

ـ نا، دایە گیان، حاڵی من زۆر باشە، ئەی بۆچی نۆشکی کوڵاویان بۆ نەهێناوی؟

ـ نامەوێ، من پێویستیم بە نۆشکی کوڵاو نییە. هەر ئەو نۆشکە کاڵە تەواوە.

ماریا پاولۆڤنا، وەک ئەوەی بیهەوێ بەرگری لە خۆی بکات گوتی: «من لە ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنام پرسی، خۆیان نەیانویست.»

ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنا گەورەیی نواند و لەوە زیاتر لە سەری نەڕۆیی و هەر ئەوەندەی گوت: «نا، من خۆم ئەمڕۆ ئیشتیام لێ نەبوو!» وەک ئەوەی بیهەوێ کۆتایی بە مشتومڕەکە بێنێ ڕووی لە

یۆڤگێنی کرد و لێی پرسی: «دەی ئێوە چیتان کرد، فۆسفاتتان لە زەوییەکان پرژاند؟»

لیزا چوو نڤشکی کولاو بێنێ.

ماریا پاولۆڤنا گوتی: «لیزا، لیزا، لەسەرەخۆ بە! ئاوا بە توندی هەنگاو مەنێ، مەترسیدارە بۆت!»

ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنا بە لەبزێکی تێکەڵ بە کینایەوە گوتی: «ئەگەر ڕۆحی ئاسوودە بێ، هیچ مەترسییەک لە گۆڕێدا نییە!» بەڵام خۆشی باش دەیزانی کە کینایەکەی هیچ بنەمایەکی نییە و لە خۆڕا قەڵسە دەگێڕێ.

لیزا گەڕایەوە و نڤشکی کولاوی هێنا. یۆڤگێنی بە بێتاقەتییەوە قاوەکەی دەخواردەوە و گوێی ڕاگرتبوو. ئەو هێندەی گوێ لەو چەلەحانێ و مشتومڕانە بووبوو ئیتر وەیدەزانی بای دێ. بەڵام ئەمڕۆ ئەم تیز و لاتاوانە زیاتر لە جاران مێشکی ئازار دەدا. دەیویست بیر لەو شتانە بکاتەوە کە بە سەری هاتبوو، بەڵام ئەم قسە پڕوپووچ و فڕ و لاتاوانە نەیاندەهێشت بیر بکاتەوە. ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنا دوای خواردنەوەی قاوەکەی هەستا و بە ڕق هەستاوی ڕۆیشت. لیزا و یۆڤگێنی و ماریا پاولۆڤنا لەوێ مانەوە و دەمەتەقێی ئاسایی و خۆمانەیان درێژە پێدا.

لیزا کە ژنێکی زیرەک و بیرتیژ بوو و ئەویندارانە لە مێردەکەی دەڕوانی و چاوانی دەخوێندەوە، لەڕێوە تێگەیشت مێردەکەی خەمێکی لە دڵدایە و لێی پرسی کە ڕووداوێک دڵتەنگی کردووە؟ یۆڤگێنی کە خۆی بۆ پرسیارێکی ئاوا ئامادە نەکردبوو، پەشۆکا و زمانی کەوتە تەتەڵە کردن و گوتی کە هیچ شتێک ڕووی نەداوە. بەڵام هەر ئەو وەڵامە زیاتری لیزا خستە گۆمی بیر و خەیاڵەوە و تووشی دڕدۆنگیی

کرد. دەیزانی و لێی ڕوون بوو کە کێشەیەک مێردەکەی بێتاقەت کردووە و تەنانەت زۆریشی ئازار دەدا و سوور سوور دەیزانی شتێک قەوماوە. بەڵام مێردەکەی نەیدەگوت کە چی بۆتە هۆی بێتاقەتی و ئازاری. بەڵام دەبێ چی ئاوا دڵتەنگی کردبێ و ڕەنجاندبێتی؟

# یازده

دوای خواردنی ناشتایی هەریەک بە لایەکدا ڕۆیشتن. یۆڤگێنی بە پێی عادەتی هەموو ڕۆژێکی چوو بۆ نووسینگەی کارەکەی. نە کتێبێکی هەڵگرت بیخوێنێتەوە و نە خۆی بە نووسینی نامەوە خەریک کرد. لە پەستا جگەرەی دەکێشا و بیری دەکردەوە. لە لایەکەوە سەری لە خۆی سووڕ مابوو و لە لایەکی دیکەشەوە ئەو هەستە دزێوە ئازاری دەدا و خەمباری کردبوو کە لە ناکاو لە ناخیدا سەری هەڵدابوو، کە ئەو قەت چاوەڕوانی نەبوو. چونکە پێی وابوو ژن هێنان لە چنگ ئەو قەیدوبەندە ڕزگاری کردووە.

لەو کاتەوە زەماوەندی کردبوو، تەنانەت بۆ جارێکیش ئەو هەستەی نە دەرهەق بەو ژنە لە دڵی خۆیدا هەست پێ کردبوو، نە دەرهەق بە ژنی دیکە. بۆ ئەو تەنیا ژنەکەی خۆ بوونی هەبوو و بەس. زۆر جار دڵی شاد بوو کە لەو بەندە ڕزگار بووە و ئێستا لە ناکاو ئەو ڕووداوە بێبایەخە سەری هەڵدابوو و دیسان خۆی لە نێو ئەو بەند و داوەدا دەدی. ئەوەی ئازاری دەدا. ئەوە نەبوو کە سەرلەنوێ بە زەبوونییەوە ئەو هەڵچوونە دەروونییە هەست پێبکا ـ لەوبارەوە تەنانەت نەیدەویست بیریش بکاتەوە ـ بەڵکوو بۆی دەرکەوتبوو کە دێوەکە هێشتا هەر زیندووە و دەبێ ململانێی لەگەڵدا بکا و ئاگای لە خۆی بێ. لەوەی کە شاخی ئەو دێوە دەشکێنێ و دەیبەزێنێ هیچ گومانێکی نەبوو.

دەبـوو نـامەیەک بنووسـێ و یادداشـتێک ئامـادە بکـات، لە پشـت مێزەکە دانیشت و خۆی بە کارەکانیەوە سەرقاڵ کرد. کاتێک کارەکەی تەواو بوو خەم و نیگەرانیەیکەی بە تەواوی لە بیر چووبۆوە. هەستا و چووە دەرێ. دەیویست سەرێک لە گەلەخـانەکە بدات، بەڵام دیسان نێوچاوانەکەی نەیهێنا و هەرکە گەیشتە بەرهەیوانی سەر قاڵدرمەمان، دیسـان کـراس و لەچـکە سـوورەکە، بەڕێـکەوت یـان ئانقەسـت، لە سـووچی دیـوارەکەوە وەدیـار کەوت و بە قـۆڵ و سـینگ و سـمتی نەرمەوە بە بەردەمیدا تێپەڕی. بەڵام هەر بەوەندە بەسندەی نەکرد و کاتێک دوو سێ هەنگاوی لێ دوور کەوتەوە، دەستی کرد بە هەڵاتن و بە کەشمونەشـم و یـاری کـردن هەوڵـی دا وەپـێش هاوکـارەکەی بکەوێ.

دیسان ئەو نیوەڕۆ گەرمە و بنجی گەزگەزک و پشت ماڵۆچکەکەی دانـیلا و سـێبەری دار بووزەکـان و ڕوخسـاری بـزە تێـزاوی ژنە کە گەڵایەکی ناسکی بە ددانە سپییەکانی گرتبوو، هاتنەوە بەرچاوی.

یۆڤگێنی لە دڵی خۆیدا گوتی: «نـا، وا دیارە ئەستەمە بتـوانم بەو شێوەیە لە بیر خۆمی بەرمەوە و ڕزگار بم لە دەستی» ڕاوەستا هەتـا ژنەکـان دوور کەوتنەوە و دیـار نەمـان. ئەو کـاتە لە قاڵدرمەکان هـاتە خـوارێ و چـوو بـۆ نووسـینگەکەی. کـاتی نـان خـواردنی نیوەڕۆبـوو، بۆیە خودا خودای بوو پێشکارەکەی لەوێ بێ. کە دەرگاکەی کـردەوە، پێشـکارەکەی لەوێ بـوو و تـازە لە خەوی نیـوەڕۆ هەسـتابوو. لە نێوەڕاستی ژوورەکەدا ڕاوەستابوو و خۆی دەکێشـایەوە و باوێشـکی دەدا. چاویشی لە گاوانێک بـوو کە هـاتبوو بـۆ نووسـینگەکە و شـتێکی پێدەگوت.

ـ ڤاسیلی نیکۆلایۆڤیچ!

ـ بەڵێ گەورەم، فەرمایشتێکتان هەیە؟
ـ دەمویست هێندێ قسەت لەگەڵ بکەم.
ـ فەرموون گەورەم، لە خزمەتدام!
ـ نا، جارێ قسەکانتان بکەن!
ڤاسیلی نیکۆلایۆڤیچ بە گاوانەکەی گوت: «یانی ناتوانی بیهێنی؟»
ـ زۆر قورسە ڤاسیلی نیکۆلایۆڤیچ!
یۆڤگێنی لێی پرسی: «چی زۆر قورسە؟»
ـ هیچ گەورەم، مانگایەک لە مەزرا زاوە! زۆر گرینگ نییە ... پێیان دەڵێم ئێسترێک لە عارەبانەکە بکەن. بچۆ بە نیکۆلای لیسۆخ بڵێ عارەبانەکە ئامادە بکات.
کابرای گاوان ڕۆیشت.
یۆڤگێنی هەستی کرد سوور هەڵگەڕاوە. گوتی: «دەمویست بڵێم ... ڤاسیلی نیکۆلایۆڤیچ ... دەزانی چی .... کاتێک ڕەبەن بووم، هێندێ جار بە لاڕێدا دەڕۆیشتم و کاری نەشیاوم دەکرد. ڕەنگە تۆش بیستبێتت.»
ڤاسیلی نیکۆلایۆڤیچ زەردەیەکی گرت. بەڵام لە ڕواڵەتدا دڵی بە ئاغا سووتا و گوتی: «ڕەنگە مەبەستت ستپاشکا[١٣] بێ!»
ــ بەڵێ ... وایە .. کەوایە دەزانی. مەسەلەکە ئەوەیە کە تکات لێدەکەم ئیتر بۆ کاری ڕۆژانە مەینێرە بۆ ماڵی ئێمە. خۆ بۆخۆت باش دەزانی کە ... هاتنی ئەو بۆ ماڵەکەی من جوان نییە و خەڵک قسە و قسەلۆکمان بۆ ساز دەکەن ...»

---

١٣- سووکەڵەناوی ستپانیدا.

ـ بەڵـێ، حەتـمەن کـاری ڤانیـایە. بەرپرسـی نووسـینگە ئەو ژنەی هێناوەتە سەر کار.

ـ باشە، کەوایە خۆت کارەکە جێبەجێ بکە!

بەو مەبەستەی شەرمەزارییەکەی خۆی بشارێتەوە، لەگەڵ گۆڕینی باسەکە درێژەی بە قسەکانی دا: «دەی، کەوایە پاشماوەی فۆسفاتەکە بە زەوییەکانەوە دەکەن!»

ـ بەڵێ گەورەم، هەرئێستا دەچم پێی ڕادەگەم!

مەسەلەکە بەم شێوەیە کۆتایی پێهات. یۆڤگێنی خـاترجەم بـوو. بەو هیـوایەی کە سـاڵێک بەبـێ دیتنـی ئەو بە ئـارامی تێپەڕیـوە، ئێسـتاش هەروا دەبـێ. لە دڵـی خۆیـدا گـوتی ڤاسـیلی بە ئیڤـانی بەرپرسـی نووسـینگەکەی دەڵـێ و ئیڤـانیش بە سـتپانیدا، ئەویـش تێدەگا کە مـن حەز ناکەم ئەو بارودۆخە درێژەی هەبێ و خۆشـحاڵ بـوو لەوەی کە سـەرەڕای دژواریـی کـارەکە، خـۆی ناچـار کـردووە لەگەڵ ڤاسـیلی نیکۆلایۆڤیچ قسـە بکات. لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەڵێ، ئاوا باشـترە و زۆریـش لەو هەسـتی دوودڵیـیە و ئەم بـارودۆخە پڕشـوورەیییە باشـترە.» کـاتێ ئەو تاوانەشـی وەبیـر هـاتەوە کە لە خەیـاڵی خۆیـدا ئەنجامی دابوو، موچڕکێکی پێدا هات.

# دوازده

ئەو هەوڵە ئەخلاقییەی یۆڤگێنی بە گیان و دڵ بە خۆی سەلماند و بە سەر شەرمی خۆیدا زاڵ بوو، وای لێکرد نهێنیی خۆی لە لای ڤاسیلی نیکۆلایۆڤیچ بدرکێنێ و هەر ئەوەش بوو بە هۆی ئەوەی ویژدانی ئاسوودە بێ. دڵی حەسایەوە و پێی وابوو هەموو شتێک کۆتایی پێ هاتووە. لیزا لەڕێوە تێگەیشت مێرەکەی خەیاڵی ئاسوودە بووە و تەنانەت لە جاران دڵخۆشترە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەم چەلەحانێ و تیز و لاتاوانەی دایکی هەردووکمان بەڕاستی بۆتە هۆی دڵتەنگی و ئازاری. ئەویش بەو هەموو دڵپاکی و هەستە ناسکەیەوە بەڕاستی بیستنی ئەو قسە تاڵ و پڕ لە تیر و توانج و تەشەرانە دەبێ زۆری ئازار بدات.»

ڕۆژی دوایی یەکشەممەی سێ پیرۆزان بوو و هەواکەی زۆر خۆش بوو، ژنانی لادێیی کە بە پێی دابی ئەو ڕۆژانە دەچوون بۆ نێو دارستانەکە تاکوو تاجە گوڵینە دروست بکەن، لە سەر ڕێگایان کاتێک لە ماڵی ئاغا نزیک بوونەوە، دەستیان کرد بە گۆرانی گوتن و سەما و هەڵپەڕکێ. ماریا پاولۆڤنا و ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنا کراسی جوان و نوێیان لەبەر کردبوو، بە چەترەوە هاتن بۆ بەرهەیوانی سەر پلیکانەکان و لە گەڕی شاییەکە نزیک بوونەوە. مامی یۆڤگێنی کە پیاوێکی دڵتەڕ و هەمیشە سەرخۆش بوو، ئەوساڵە هاوینەکەی میوانی ئەوان بوو. پیرەپیاو بە دەموچاوێکی پەنەمیو و جلوبەرگی هەورێشمی چینییەوە، لەگەڵ ئەوان هاتبووە دەرێ.

وەک هەمیشـە بـازنەی ژنـانی جحێڵ و کچـانی لادێیـی بە جلـوبەرگی ڕەنگـاوڕەنگەوە لە نێوەڕاسـتی ئـاپۆرەکەدا بـوون و دەسـتەیەکی تـر بە شێوەی بازنەیی دەستیان گرتبوو، هەڵدەپەڕین و دەوری گۆڕەپانەکەیـان لێـدەدا و کـۆلکەزێڕینەیەکی بزۆکیـان پێکهێنـابوو. ئەو کچـانە دەسـت لە دەسـتی یەکـدا هەڵـدەپەڕین و تەشـک و داوێنـی کراسـە چییـتە نـوێ و ڕەنگاوڕەنگەکانیـان خشەخشـی دەهـات. کوڕان قاقایـان دەکێشـا و لەگەڵ گەڕی شـاییەکە دەچـوونە پێشـێ و دەهـاتنەوە دواوە. پۆلێـک لاوی تـر بە کـورتەکی ڕەش و کەهـوو و کراسـی سـوور و ئـارەقچن لە سـەردا، بەردەوام خەریکی توو ترووکاندن بوون و تێخوڵەکانیـان تف دەکردەوە. خزمەتکارەکـان و خەڵکـانی غەوارە کە لە گونـدەکانی دیـکەوە هـاتبوون، دوورتـر ڕاوەسـتابوون و چاویـان لەو سـەما و دیـلان و بەزمە دەکـرد. هەردوو ژنەکە واتە دایکـی یـۆڤگێنی و لیـزا چـوون بـۆ قەراغ شـاییەکە و لیـزاش بە دوای ئەوانـدا کە کراسـێکی شـینی لە بەر کردبـوو و تەنزیـل و قردیلەی ڕەنگینـی لە کەزیەی دابـوو، لە ژێـر قـۆڵە فشـوفۆڵەکەیدا زەنـد و مەچەکە باریک و سپییەکەی و بەلەمرکە تیژەکەی دیار بوو.

یـۆڤگێنی حەزی نەدەکـرد بچێـتە دەرێ، بەڵام خۆشاردنەوەشـی بە کـارێکی نـاجەز دەزانـی و بە جگەرە کێشـان هـات بـۆ بەرهەیـوانی سـەر پلیکانەکـان و سـەرێکی بـۆ لاوان و موژیکەکـان لەقانـد و لەگەڵ یەکێـک لەوان سـەری قسـەی کـردەوە! لەو سـەروبەندەدا ژنـان پـڕ بە گەروو گۆرانییان دەچڕی و بە دەم سەما و هەڵپەڕکێوە چەقەنەیان لێدەدا.

مێرمنداڵێک کە گوێی لە دەنگی هەرا کردنی لیزا بووبوو، هـات بۆ لای یـۆڤگێنی و گـوتی: «ئاغـا، خـانم بانگت دەکـا!» لیـزا بـانگی دەکـرد تـاکوو یەکێک لە ژنەکان ببینێ کە زۆر جوان سەمای دەکرد و سـەرنجی ئەوی ڕاکێشابوو. ئەو ژنە ستپانیدا بـوو، سـارافۆنێکی قـۆڵ فشـی زەردی لە بەر

کردبوو، بەژنی کراسەکەی قوڵە و سەرشان و کەمەرەکەی چیندار بوو، لەچکەیەکی هەوریشمینی بە سەردا دابوو. زۆر شاد و لەجۆش سەمای دەکرد و سەرنجی هەمووانی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو. دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو و لێوی پڕ بزەی بە شیلەبزەیەکی دلڕفێن ڕازابۆوە. بەڕاستی سەما و کەشمونەشمەکەی جوان و دڵبزوێن بوو، بەڵام یۆڤگێنی نەیدیبوو.

چاویلکەکەی ڕاستەوپاستە کرد و کە چاوی پێی کەوت گوتی: «بەڵێ، بەڵێ!» لە دڵی خۆشیدا گوتی: «وا دیارە من ناتوانم خۆم لە داوی ئەو ژنە دەرباز بکەم!»

یۆڤگێنی چاوی لێ نەکرد چونکە لە سێحری چاوانی و دڵڕفێنییەکەی دەترسا، بەتایبەت کاتێک ترووسکەی چاوی و نیگا نەرم و پڕ نازەکەی لە چاوی دەدرا، تەزووی بە ناخیدا دەهێنا و دەیخستە دڵەکوتێ. جگە لەوەش یۆڤگێنی دەیزانی کە ژنە خۆ بۆ ئەو دەنوێنێ و دەیهەوێ بە نیگا و نازە سووتێنەرەکەی هەستی بجووڵێنێ و سەرنجی بۆ لای خۆی ڕابکێشێ. هەتا ئەو جێیەی کە دابونەریت ڕێگای دا لەوێ مایەوە و کە دیتی ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنا، ستپانیدای بانگ کرد بۆ لای خۆی، بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو و هەڵسوکەوتێکی درۆیینەوە پێی گوت: «ئازیزەکەم!» و لەگەڵی کەوتە دەمەتەقێ، بەپەلە وەرسووڕا و لەوێ دوور کەوتەوە و خۆی کردەوە بە ژووریدا. بۆیە ڕۆیشتەوە بۆ ماڵێ تاکوو ژنە نەبینێ، بەڵام ڕۆیشت بۆ نهۆمی سەرێ و بەبێ ئەوەی خۆی بزانێ چۆن و بە چ مەبەستێک، ڕۆیشت بۆ بەرپەنجەرەکە و لە تەواوی ئەو ماوەیەدا کە ژنەکان لە گۆڕەپانی بەر قاڵدرمەکاندا کۆ ببوونەوە و خەریکی سەما و هەڵپەڕکێ بوون، چاوی لە سەر ژنە هەڵنەگرت و

تامەزرۆیانە لە لەشولاری ڕاما و دیتنی کولمەی سوور و قۆڵ و بەلەکی ڕووتی، ئۆخژنی بە دڵی دەبەخشی.

کە دیتی هیچ کەس چاوی لێ نییە، بەپەلە هاتە خوارێ و بەبێ چرپە ڕۆیشت بۆ بەرهەیوانەکە، لەوێ جگەرەیەکی داییساند و بە بیانووی پیاسە کردن لە نێو باخەکە، ڕاست بەو لایەدا ڕۆیشت کە ستپانیدای پێدا ڕۆیشتبوو. هێشتا چەند هەنگاو نەڕۆیشتبوو درووسکەی کورتەکێکی چیندار و تەنوورە و لەچکەیەکی سوور لە پشت دارەکانەوە سەرنجی ڕاکێشا. ستپانیدا بوو لەگەڵ ژنێکی تر بە نەرمی هەنگاویان دەنا. مۆچڕکێکی پێدا هات و لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەوانە بۆ کوێ دەچن؟»

لە ناکاو هەست و حەزێکی بەتین لە ناخی گەڕا. دەتگوت دەستێکی بەهێز گرتوویە و ڕایدەکێشێ. دڵی بە پڕتاو لێی دەدا و دەتگوت چنگی کەسێک لە ناخی سینگیدا هەڵیدەگولۆفێ. چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد و ڕۆیشت بۆ لای.

دەنگێک لە پشت سەریەوە بانگی کرد: «یۆڤگێنی ئیڤانۆڤیچ، یۆڤگێنی ئیڤانۆڤیچ، من هاتووم عەرزی بەڕێزتانی بکەم کە ...» یۆڤگێنی، سامۆخینی کەرێزکەنی دی کە چەند ڕۆژ بوو خەریکی هەڵکەندنی چاڵاو بوو. وەخۆ هاتەوە و بەپەلە ئاوڕی دایەوە. چوو بۆ لای سامۆخین و لەگەڵ ئەوەی قسەی لەگەڵ کابرای کەرێزکەن دەکرد، سەری وەرسووڕاند و دیتی ستپانیدا و ژنەکەی هاوڕێی بە سەراولێژییەکەدا داگەڕان بۆ لای چاڵاوەکە، یان چوون بۆ سەر چاڵاوەکە و چاو لێکردنیان کردە بیانوو. هەردوو ژنە بە نەرمی چوون بۆ سەر چاڵاوەکە و دوای ئەوەی تۆزێ ڕاوەستان، بە هەڵەداوان بۆ لای کۆڕی سەما و هەڵپەڕکێکە گەڕانەوە.

# سێزده

یـــۆڤگێنی دوای ئەوەی لەگەڵ ســـامۆخین قســـەکانی تەواو بـــوو، گەڕایەوە بۆ مـاڵێ، بەڵام وەهـا دامـاو و شـڵەژا بوو، دەتگوت تووشـی جینایەتێکی سامناک بووە. زیـاتریش بەو هـۆیەوە بوو کە سـتپانیدا لە مەبەستەکەی تێگەیشتبوو و دەیزانی کە ئەو، یانی یۆڤگێنی تـامەزرۆی ژوان و لە ئامێز گرتنیەتی و خۆشـی ئەو حەز و ئـاواتە لە دڵیدا بوو. لە لایەکـی تریشـەوە دەیزانـی کە ئەو ژنە یـانی ئانـا پرۆخۆرۆڤـاش[14] بەوەی زانیوە.

گرینک ئەوە بوو کە ئەو خۆی هەستی دەکرد شکستی خواردووە و ئیتـــر ئیـــرادەی لە دەســـتی خۆیـــدا نەمـــاوە و وزەیەکـــی دیـــکە هەڵیدەســـووڕێنێ. ئەمـــڕۆ ڕێکەوتنێکـــی پیـــرۆز ڕزگـــاری کردبـــوو و نەیهێشـــتبوو تووشـــی ئەو خمخـــۆرکە ببێـــتەوە، بەڵام ســـوور ســـوور دەیزانـــی ئەگەر ئەمـــڕۆش نەبـــێ، ســـبەینێ یـــان دوو ڕۆژی دیـــکە تێدەکەوێ و تێدادەچێ.

بەڵـــێ تێـــدادەچێ. ئەو لە بەرچـــاوی بـــوو کە تووشـــی چ ڕۆژەڕەشییەک دەبێ ـ خیانەت کردن لە ژنەکەی، لە ژنێک کە ڕۆح و گیانی لەگەڵیەتی و خۆشـی دەوێ. لە گوند و لەگەڵ ژنێکی لادێیی، لە بەرچاوی هەموو خەڵکی، ئەی ڕۆژەڕەشی و تێداچوون ئەوە نییە؟ بێ

---

14- Ana Prokhorova

ئـابڕوویی، ڕەش بـوون لە بەرچـاوی خەڵـک، دوای ئەوە چـۆن لە نێـو کۆمەڵدا سەری هەڵێنایە، ئیتر دوای ئەوە مەحاڵ بـوو بتوانێ بژی. نـا، دەبێ ڕێگەچارەیەک بدۆزێتەوە.

لە دڵـی خۆیـدا گـوتی: «خـودایە گیـان، خـودایە گیـان چـبکەم؟ یـانی دەبێ من بەو شـێوەیە تووشـی زەلکاو بم و تێدابچم؟ یانی بەڕاسـتی هـیچ ڕێگەچـارەیەک نیـیە؟ بەڵام هەرچـۆنێکە دەبـێ کارێـک بـکەم و ڕێگەچارەیەک بدۆزمەوە!»

حوکمی لە خۆی دەکرد: «بیر لە ئەو مەکەوە، بیر لە ئەو مەکەوە!» هەر لەو کـاتەدا ئەوی وەبیـر دەهـاتەوە دەیهێنـایە بەرچـاوی خـۆی، لە ژێر دارە بووزەکاندا.

چیرۆکێکـی وەبیـر هـاتەوە کە لە جێیەک خوێنـدبوویەوە. چیرۆکـی پیاوێکی تەرکەدنیا کە شەیدای ژنێکی جوان ببـوو و دەبـوو دەسـت بە لەشـیدا بێنـێ و شـیفای پـێ ببەخشـێ، بـۆیە بـۆ ڕزگـار بـوون لە وەسوەسـەی هەوەس، دەسـتەکەی دیـکەی خسـتبووە سـەر ئـاور، بە جۆرێک کە قامکەکانی سووتابوون. کە ئەو چیـرۆکەی وەبیـر هـاتەوە لە دڵـی خۆیـدا گـوتی: «بەڵـێ، منـیش وای بە بـاش دەزانـم قامکەکـانم بسـووتێنم و ڕۆحـی خـۆم لە زایە بـوون ڕزگـار بـکەم.» چـاوێکی لە دەوروبەری خـۆی کـرد کە دڵنیـا بـێ هـیچ کەس لە ژوورەکەدا نیـیە. پاشان مۆمێکی هەڵکرد و لەگەڵ ئەوەی بە توانجەوە بە خۆی دەگوت: «دەی ئێستا بیر لە ئەو بکەوە» قامکی لەسـەر گڕی مۆمەکە ڕاگرت. بەڵام قامکی سووتا و بێ ئیختیـار کێشـایە دواوە کە بە دووکەڵ ڕەش هەڵکەڕابـوو. مـۆمەکەی کوژانـدەوە و فڕێـی دا و لەگەڵ ئەوەی بە گەوجێتیـی خـۆی پێکەنـی، گـوتی: «ئەو فکـرە قـۆڕە! دەبـێ ڕێگـایەک بدۆزمەوە کە ئیتر چاوم پێی نەکەوێ. یـان خـۆم لێرە بڕۆم یان ئەو

لێرە دوور بخەمەوە. پارەیەک دەدەم بە مێردەکەی کە بیبیات بۆ شار یان گوندێکی دیکە. دەی ئاوا هەمووان دەزانن و دەمدەنە بەر پلاری تەوس و توانج. هەرچی دەیڵێن با بیڵێن. هەرچییەک بێ لە بەرەوڕوو بوون لەگەڵ ئەو مەترسییە باشترە. بەڵێ، ئەوە کارێکە دەبێ هەرچی زووتر جێبەجێی بکەم!» ئەم قسانەی لەگەڵ خۆی دەکرد و چاوی لە سەر ئەو هەڵنەدەگرت. لە ناکاو لە خۆی پرسی: «ئێستا خەریکە بۆ کوێ دەچێ؟» پێی وا بوو ژنە دیتوویەتی لە پشت پەنجەرەکەوە ڕاوەستاوە و تەماشای دەکا. چاوێکی لە پەنجەرەکە کرد و دەستی ژنێکی گرت و لەگەڵ ئەوەی بە توندی دەستیان ڕادەوەشاند بە ڕێگای باخەکەدا ڕۆیشتن. یۆڤگێنی بێ ئەوەی خۆی بزانێ بۆچی و بە چ مەبەستێک لەو فکرەی خۆی ڕازییە، ڕۆیشت بۆ نووسینگەی ملکەکەی.

ڤاسیلی نیکۆلایۆڤیچ جلوبەرگی جێژنی لە بەردا و ڕۆنی لە قژی دابوو، لەگەڵ ژنەکەی و میوانەکەی کە لەچکەی بە سەردا دابوو، لە سەر مێزەکە چاییان دەخواردەوە.

ـ ڤاسلی نیکۆلایۆڤیچ، دەمەوێ قسەت لەگەڵ بکەم.

ـ باشە، فەرموو گەورەم!

ـ نا، وا باشترە بێیە دەرێ!

ـ هەرئێستا، بەڵام پەلە مەکە با کڵاوەکەم لە سەر کەم.» ڕووی لە ژنەکەی کرد و گوتی: «تانیا، سەری دووکەڵکێشی سەماوەرەکە بنێوە!» کڵاوەکەی لە سەری کرد و شاد و لێو بەبزە هاتە دەرێ.

یۆڤگێنی بۆی دەرکەوت کە گزیرەکەی ڤۆدکای خواردۆتەوە. بەڵام چاری نەبوو. ڕەنگە ئەوە باشتر بێ و لە کاتی سەرخۆشیدا باشتر دەیتوانی پرێسکەی دڵی لە لا بکاتەوە.

یۆڤگێنی گوتی: «ڤاسیلی نیکۆلایۆڤیچ، دەمەوێ دیسان سەبارەت بە بابەتەکەی پێشوو قسەت لەگەڵ بکەم، سەبارەت بەو ژنە!»

- چۆن؟ من خۆم پێم گوتن ئیتر کاری پێ نەدەن!

ـ نا، من بیرێکی باشترم کردۆتەوە و دەمەهەوێ سەبارەت بەو بیرەی خۆم قسەت لەگەڵ بکەم. ناکرێ لێرە دووریان بخەینەوە؟ ناکرێ هەموو بنەماڵەکەیان بۆ شوێنێکی دیکە ڕاگوێزین؟

ڤاسیلی نیکۆلایۆڤیچ بە لەبزێکی نابەدڵانە و بە جۆرێک کە یۆڤگێنی پێی وابوو تانە و تەشەری پێوەیە، گوتی: «چۆن؟ جا بۆ کوێیان ڕاگوێزین؟»

- من پێموایە دەکرێ بڕێک پارەیان پێ بدەین و زەوییەک ، بۆ وێنە لە کۆلتۆڤسکی[15]، دەتوانین پێملیان بکەین بچن بۆ ئەوێ و ئیتر لێرە نەمێنن.

ـ بەڵام چۆن، بچن بۆ کوێ؟ ئەوان ژین و ژیواریان لێرەیە. پشتاوپشتیان لێرە بووە. ئێستا چ کارێکی بە ئێوەیە کە ئاوا دەتەوێ لێرە بڕۆن؟

- ڤاسیلی نیکۆلایۆڤیچ، دەبێ ئەوە تێبگەی، ئەگەر خانم بەوە بزانێ، چبکەم؟

- بۆ دەزانێ؟ کێ هەیە شۆڤاری بکات؟

ـ بەڵام چۆن دەکرێ بەو ترس و دڵەڕاوکێیەوە بژیم! بەڕاستی کەوتوومەتە بارودۆخێکی زۆر نالەبارەوە!

- بۆ لەخۆڕا دڵی خۆت نارەحەت دەکەی؟ خەمت نەبێ. کێ هەیە کە بیهەوێ کای کۆن بە با بکاتەوە؟ وەک دەڵێن "ڕابردوو مەهێنە کایە،

---

15- Koltovsky

دنیا کە مەرگی لە دوایە" یان وەکوو پێشینیان دەڵێن "دنیایە لە کەو دە، بێگوناهێکی نییە، کەس بێهەڵە نەژیاوە لە سەر ئەم زەوییە."»

ــ لەگەڵ ئەوەشدا وا باشترە لێرە نەمێنن. تۆ ناتوانی لەگەڵ مێردەکەی قسە بکەی؟

ـ ئاخر چیی پێ بڵێم؟ باشە یۆڤگێنی ئیڤانۆڤیچ، تۆ بۆ لەخۆڕا دنیات لە خۆت کردۆتە چەرمە چۆلەکە؟ کێ لێرە هەیە کە خراپەی تۆی بوێ؟ یان شتێ بڵێ؟ هەموو خەڵکی چاویان لە تۆیە و ڕەفتاری تۆ دەکەنە سەرمەشقی خۆیان.

ـ لەگەڵ ئەوەشدا بچۆ قسەیان لەگەڵ بکە.

ـ باشە، پێیان دەڵێم.

ئەگەرچی دەیزانی ئەو کارە هیچ ئاکامێکی نییە، هەر ئەو دەردەدڵ کردنەی لەگەڵ گزیرەکەی تۆزێ ئاسوودەی کرد. گرینگ ئەوە بوو هەستی دەکرد نیگەرانییەکەی زیاتر لە ڕادەی خۆی مەترسییەکەی لە بەرچاوی گەورە کردۆتەوە.

باشە مەگین قەراری جێژوانی لەگەڵ دانابوو؟ شتی وا مەحاڵ بوو. چووبوو لە نێو باخەکەدا پیاسە بکات و ژنەش بە ڕێکەوت لەوێوە تێپەڕیبوو. هەر ئەوە و بڕایەوە!

# چاردە

هەر ئەو ڕۆژەی جێژنـی سـێ پیـرۆزان کە یـۆڤگێنی دوای نـانی نیوەڕۆ لەگەڵ ژنەکەی چوون بۆ پیاسە کردن لە نێو باخەکە، لەوێوە ژنەکەی برد بۆ مەزرا تاکوو سێوەڕەی لەوەڕگاکەی پیشـان بدا، لیزا لەوێ کاتێـک ویسـتی لە جـۆگەیەک بپەڕێـتەوە، بـازی دا و لە کـاتی بـازدانەکەدا لاقـی وەرگەڕا و کەوت. هەڵـبەت بە نەرمـی بە سـەر لاتەنیشتدا کەوت و قیژاندی، یۆڤگێنی لە ڕوخساریدا نەک هەر ترس، بەڵکوو ژانیشی دی. ویستی هەڵیبستێنێتەوە، بەڵام لیزا دەستی نەدایە و بە شـیلەبزەیەکەوە گـوتی: «نـا، پەلە مەکە یـۆڤگێنی، خـۆم هەڵدەستمەوە. هـیچ نەبوو. تەنیا لاقـم وەرگەڕا!» هەروا کە کەوتبوو یۆڤگێنی چاوی لە چاوی کرد و لە نیگایدا نیشانەی خەتای دی.

ڤارڤـارا ئەلکسـی یۆڤنـا گـوتی: «ئـاخر چەنـدەتان پـێ بڵـێم ژنـی دووگیان نابێ ئەوەندە جرپن و هەڵەشە بێ!»

- هیچ نییە دایە گیان، ئێستا هەڵدەستمەوە!

مێردەکەی یارمەتیی دا و هەستایەوە، بەڵام هەر لەو کاتەدا ڕەنگی پەڕی و ئاسەواری ترس لە ڕوخساریدا وەدیار کەوت.

- بەڵێ وا دیارە حاڵم باش نییە.

دایکی بانگی کرد و شتێکی بە گوێدا چرپاند.

ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنا هاواری لێ هەستا: «ئەیڕۆ، بەدبەخت خۆم، خودایە گیـان، دیتـووتە چ بەڵایەکتـان بە سـەر کـچەکەم هێنـا! من پێم

گوتن مەچن. ڕاوەستن من دەچم بۆ لای خزمەتکارەکان. کچەکەم نابێ بە ڕێدا بڕوا، دەبێ لە سەر عارەبانە و بە ڕاکشاوی بیبەنەوە بۆ ماڵێ.»

یۆڤگێنی بە دەستی چەپی گرتی و گوتی: «مەترسە لیزا گیان، خۆم دەتبەمەوە. دەستت لە ملم ئاڵێنە. بەڵێ، ئاوا!»

دانەوی، باوەشی کرد بە قاچیدا و بەرزی کردەوە، دوای ئەوە ئیتر هیچ کات ئازاری ئاوێتەی شیرین کامیی بە ئاشکرای لە ڕوخساری هاوسەرەکەیدا لە بیر نەچۆوە.

لیزا بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: «خۆشەویستەکەم، من زۆر قورسم! دایکم خەریکە دەڕوا. پێی بڵێ ڕاوەستێ.» سەری دانەواند و ماچی کرد. دیار بوو دەیهەوێ دایکی بگەڕێتەوە و ببینێ کە مێردەکەی چۆنی لە باوەش کردووە.

یۆڤگێنی بانگی ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنای کرد کە پەلە نەکات و ئەو دەتوانێ لیزا بگەیێنێتەوە بۆ ماڵێ. ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنا ڕاوەستا و کە چاوی پێیان کەوت زۆر توندتر لە پێشوو دای لە قوڵپەی گریان و بانگ و هاوار: «داینێ، کچەکەم دەخەی. من دەزانم دەیخەیە خوارێ. داینێ، تۆ دەتهەوێ کچەکەم بکووژی. تۆ ڕێزەیەک ویژدانت نییە!»

- نا، مەترسە نایخەمە خوارێ. خۆ ئەوەندە قورس نییە.

- نابێ تۆ لە باوەشی کەی، داینێ. من ناتوانم ببینم تۆ لە بەرچاوی خۆم کچەکەم دەکوژی.

ئەوەی گوت و بە هەڵەداوان خۆی کرد بە نێو باخەکەدا.

لیزا بە بزەیەکەوە گوتی: «گوێی مەدەیە خۆشەویستەکەم.»

- خۆزگە وەک ئەوجارە تووشی کێشە نەبین.

ـ نا، مەبەستم ئەوە نییە خۆشەویستەکەم. ئەمەیان هیچ گرینگ نییە. من مەبەستم قسەکانی دایکمە. باشە دامنێ، ماندوو بووی. تۆزێ پشوو بدە.

بەڵام یۆڤگێنی ئەگەرچی زۆر ماندوو ببوو، بە ڕووخۆشی و غولوورەوە گەیاندییەوە ماڵێ و لیزای نەدایە دەست ئەو خزمەتکار و ئاشپەزەی کە ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنا پەیدای کردبوو و ناردبوونی بۆ یارمەتی و بە هەڵەداوان بەرەوپیریان دەهاتن. لیزای بردە ژووری خەوەکەی و لە سەر پێخەفەکەی ڕایکێشا.

لیزا گوتی: «باشە، ئیتر بڕۆ.» دەستی گرت کێشای بۆ لای خۆی، ماچی کرد و گوتی: «من و ئانووشکا خۆمان بە هەموو کارەکان ڕادەگەین، خەمت نەبێ؛ تۆ بڕۆ.»

ماریا پاولۆڤناش لە خانووەکەی تەنیشتەوە خۆی گەیاندە لایان. جلەکانی لە بەری لیزا داکەند و لە نێو پێخەفەکەدا ڕایکێشا. یۆڤگێنی لە ژووری میوانداری کتێبێکی بە دەستەوە، مات و چاوەڕوان دانیشتبوو. ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنا بە پەنایدا تێپەڕی و هەڵسوکەوتی هێندە تۆسنانە و پڕ لە سەرکۆنە و لۆمە بوو، هێندەش گرژ و نێوچاوان تاڵ بوو دەتگوت هەوری بەهارە، بۆیە ترسی شکاندە دڵی یۆڤگێنی. بە زمان تێکەڵهاتنەوە لە خەسووی پرسی: «دایە گیان، لیزا چۆنە؟ چیتان کرد؟»

ـ چبکەین؟ ئەوە پرسیارە تۆ دەیکەی؟ ئەوەی کە پێت خۆشە بیبیستی هەر ئەوەیە. ئەگەر پێت خۆش نەبوایە. نەتدەخستە نێو جۆگە ئاوەکەوە.

یۆڤگێنی بە توورەیی دەنگی هەڵبڕی: «ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنا، ئیتر هەڵسوکەوتت زۆر ناحەز بووە و بە تەواوی شووت لێ هەڵکێشاوە.

ئەگەر دەتهەوێ خەڵکی ئازار بدەی و دڵیان بڕەنجێنی و ژیانیان لێ تاڵ بکەی ...» دەیویست درێژەی پێ بدا: «... ئێرە جێی ئەوە نییە. بڕۆ بۆ شوێنێکی تر.» بەڵام ددانی بە خۆیدا گرت و گوتی: «بۆ ئەو بارودۆخەت بە لاوە گرینگ نییە و سەرت لە کێشە دەخورێ؟»

ــ «تاقەتی چەلەحانێم نییە، ئیتر کار لە کار ترازاوە.» شەوکڵاوەکەی قیت نا بە تیلاگی سەریەوە و ڕۆیشتە دەرێ.

لیزا بەڕاستی خراپ کەوتبوو. لاقی وەرگەڕابوو و زەبری وێکەوتبوو. مەترسیی ئەوەش لە گۆڕێدا بوو کە دیسان منداڵەکەی لە بار بچێ. هەموو دەیانزانی کە هیچ کارێکیان لە دەست نایە و دەبێ ڕاکشێ و پشوو بدا. لەگەڵ ئەوەشدا بڕیاریان دا کەسێک بنێرن بۆ شار و پزیشک بێنێ.

یۆڤگێنی بۆ پزیشکەکەی نووسی: «جەنابی نیکۆلای سیمۆنۆڤیچ، ئێوە هەمیشە لەگەڵ مندا گەورەییتان نواندووە و بە دەنگمەوە هاتوون، هیوادارم ئەمجارەش دەست بە ڕوومەوە نەنێی و بگەیە فریای ژنەکەم. ئەو لە ... هەتا دوایی.» کە نامەکەی نووسی ڕۆیشت بۆ گەلەخانەکە تاکوو ئەسپ و عارەبانە ئامادە بکات. چەند ئەسپ پێویست بوو بۆ هێنانی پزیشکەکە و دیسان بردنەوەی بۆ شار. کاتێک کاری مڵکەکە پڕ پیت و گەشە نییە، ئەو کارە بە خێرایی جێبەجێ نابێ و دەبێ تەگبیری بۆ بکات، تاکوو کارەکەی چەتی تێنەکەوێ. مشووری کارەکەی خوارد و عارەبانەچییەکی نارد بە دوای پزیشکدا. سەعات نۆ لای دابوو کە گەڕایەوە بۆ ماڵێ. لیزا ڕاکشابوو و دەیگوت حاڵی باشە و هیچ کوێی نایێشێ. بەڵام ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنا لە ژوورسەری دانیشتبوو، بە چەند دەفتەری نۆتە سێبەری بۆ چاوی کردبوو کە شۆقی چراکە لە چاوی نەدا، خۆشی

خەریکی چنینی بەتانییەکی سووری گەورە بوو. ڕەفتاری هاواری دەکرد کە دوای ئەو ڕووداوە بۆ ئەوە نابێ چاوەڕوانیی ئاشتیت لێی هەبێ و جگە لە ئەو کە ئەرکی خۆی بە باشی بەجێ دێنێ، هەموان تووشی تاوان و خەتا دەبن.

یۆڤگێنی ئەو حاڵەتەی خەسووی دی و بۆ ئەوەی وا بنوێنێ کە ئاگای لە هیچ نییە، بە لەبزێکی شاد و بەری لە خەم و دڵەڕاوکێوە بۆی باس کرد کە لە گەلەخانەکە چیی کردووە و بە ئاسانی بە جێی بارگینەکە کابووشکای[16] لە ترویکاکە کردووە و ناردوویە بە دوای دوکتۆر نیکۆلای سیمۆنۆڤیچدا.

ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنا؟ لە پشت چاویلکە پێنسییەکەیەوە چاوی لە بەتانییە چندراوەکەی کرد و لەگەڵ ئەوەی لە چراکەی نزیک دەکردەوە، گوتی: «بەڵێ، جا دیارە چەندە کەمتەرخەمی، ئێستا کە یارمەتی پێویستە، ڕۆیشتووی بە لای ئەسپ سوارییەوە و ڕایدەبوێری. ڕەنگە قەستی ئەوەت بێ دوکتۆریش بخەیتە نێو کەندەڵان یان چۆمێکەوە.»

ـ بەڵام دەبوو کەسێک بنێرم بە دوای دوکتۆردا و من دەمویست ئەو کارە بە باشترین شێوە بەڕێوە بچێ.

ـ بەڵێ لە بیرمە کە ئەو ئەسپانەتان چۆن وەک با و بۆران لە وێستگەوە منیان هێنا بۆ ئێرە.

ئەمە بەهانەیەک بوو کە ئەو ماوەیەک بوو بۆ گلە و بناشت کردبوویە بنێشتەخۆشکە. یۆڤگێنی لە ڕووی هەڵەشەییەوە گوتی کە ئەم وتەیەی ئەو دوور لە ڕاستییە و باوەڕی پێ ناکا.

16- Kabushka

ـ من هەمیشە دەڵێم، چەند جاریشم بە پرەنس گوتبوو، کە هیچ ئازارێک لەوە خراپتر نییە کە مرۆڤ لەگەڵ کەسانێکی ناڕاست و ڕیاباز بژی و من هەموو شتێکم پێ تامڵ دەکرێ، بەڵام مەرایی و ناڕاستیم بە هیچ شێوەیەک پێ تامڵ ناکرێ.

یۆڤگێنی گوتی: «بەڵام لێرە من لە هەمووان زیاتر ئازار دەکێشم.»

ـ بەڵێ، دیارە!

ـ چی دیارە؟

ـ هیچ، لێم گەڕێ با کارەکەم بکەم، خەریکم گۆلی کامواکە دەژمێرم.

یۆڤگێنی لە پاڵ تەختی خەوەکەدا ڕاوەستابوو و لیزا چاوی لێدەکرد و بە دەستە تەڕەکەی کە لە سەر بەتانییەکە درێژی کردبوو دەستی مێردەکەی گرت و گوشیی. چاوەکانی پێی دەگوت: «لەبەر دڵی من چاوپۆشی لە قسەکانی بکە و دڵت گەورە بێ. تۆ دەزانی هیچ شتێک ناتوانێ ببێتە کۆسپ لە سەر ڕێگای ئەشقەکەماندا.»

یۆڤگێنی لەسەرەخۆ گوتی: «ئیتر هیچ ناڵێم، قەیناکا!» دەستی تەڕ و شووش و باریکی ڕامووسی و پاشان چاوانی جوان و مێهرەبانی ماچباران کرد و پێڵووی ناسکی لە ژێر لێویدا بە نەرمی وێک دەهاتنەوە.

یۆڤگێنی گوتی: «یانی ئەمجارەش لەوانەیە وەک جاری پێشوومان بە سەر بێ؟ ئێستا حاڵت چۆنە؟»

لیزا چاوی لە زگی خۆی کرد و گوتی: «شتێکی سەیرە، هیوادارم هەڵەم نەکردبێ. بەڵام هەست دەکەم زیندووە و زیندووش دەمێنێ!»

ـ پەککوو کە بیر لەوە دەکەمەوە لەوانەیە منداڵەکەت لە بار بچێ، هەر ئەوەندەیە شێت نابم.

لیزا زۆری پێداگری کرد کە شەوێ بەجێی بێڵێ و بچێت بخەوێ و پشو بدات بەڵام یۆڤگێنی لە ژوورسەری مایەوە و دڵی نەهات بەجێی بێڵێ و هەتا بەیانی چاوەدێریی لێکرد و لە سەر هەست بوو. لیزا ئەو شـــەوەی بە ئـــارامی تێپەڕانـــد و ئەگەر کەســـێک نەچووبـــایە بە دوای دوکتۆردا، لەوانە بوو هەستێ و بە ڕێدا بڕوا.

پزیشک ڕۆژی دوایی کاتی نانی نیوەڕۆ گەیشتێ و گوتی چونکە جاری یەکەمی نییە منداڵی لە بار دەچێ، نابەجێ نییە کە نیگەران بن، بەڵام لە ڕاستیدا دیاردەی ئەرێنیش لە پشکنینەکانی دوکتۆردا بەرچاو نەکەوت. بەڵام بەوەدا کە ئاســـەوارێک بـــۆ ڕەتکـــردنەوەی گریمـــانەی مەترسی نییە، دەتوانین بەو ئاکامە بگەین کە لە لایەکەوە ... لایەکی دیکەشەوە چونکە دەتوانین ترسی ئەوەمان بێ کە... هەر بەو هۆیە دەبێ نەخۆشەکە پشوو بدات و ئەگەرچی حەز ناکات دەوا و دەرمانی بداتێ، بەڵام بە پێویستی دەزانێ ئەم دەوایەی کە دەیداتێ بیخوات و لە پـــێخەفەکەی نەیەتە دەرێ. جـــگە لەوەش ســـەبارەت بە پشـــکنینی حەستەی لیزا بۆ ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنای ڕوون کردەوە و ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤناش بە لەقاندنی سەری، قسەکانی پزیشکی پەسند دەکرد. لە کۆتاییـــدا هەقدەســـتی دوکتۆریـــان دا و ئەویـــش خێـــرا پـــارەکەی لە قولەمیچەی گرت و ڕۆیشت. نەخۆشەکەش بۆ ماوەی حەوتوویەک لە پێخەفدا مایەوە و پشووی دا.

# پازده

یـۆڤگێنی زۆربەی کاتەکـانی لە ژوورســەری ژنەکەی دەمــایەوە. قسەی لەگەڵ دەکرد و کتێبی بۆ دەخوێندەوە. تـانە و تەشـەر و قسـە ڕەقەکانی ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنای تامڵ دەکرد و هیچی نەدەگوت، ئەو دەیتوانی وەڵامـی تیز و تەوسـەکانی بداتەوە و ئەوەش زۆر دژوارتـر بوو.

بەڵام نەیدەتوانی ڕۆژ و شـەو لە مـاڵێ دانیشـێ: یەکەم بەو هـۆیەی کە ژنەکەی دەینــاردە دەرێ و دەیگــوت ئەگەر بەردەوام لە لای مــن دانیشی، نەخۆش دەکەوی و دووهەم بەو هـۆیەی کە پێویسـت بوو بە کاروباری مڵکەکەی ڕابگا. ئەو نەیدەتوانی لە ماڵێ بمێنێتەوە و دەچـوو بـۆ مەزرا و دارســتانەکە و ســەری لە بـاخ و خەرمـانەکە دەدا و لە هەموو جێیەک نەک هەر خەیاڵ، بەڵکوو وێنەی زیندووی سـتپانیدای دەدی و هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵی دەگەڕا و زۆر بە دەگمەن لە بیری دەچۆوە. بەڵام ئەوەش زۆر گرینگ نەبوو. چونکە دەیتوانی بە سـەر ئەو هەســتەی خۆیـدا زاڵ بـێ. لە هەمــوو خراپتــر ئەوە بــوو کە لە ڕابـردوودا چەنـدین مانـگ نەیدەدی و فەرامۆشـی دەکـرد بەڵام ئێسـتا بەردەوام لە بەرچـاوی بـوو یـان تووشـی دەبوو. دیـار بـوو سـتپانیدا بـۆی دەرکەوتـووە کە ئاغـا خوازیـاری تـازە کـردنەوەی پێوەنـدییە و هەرجـارەی بە بیـانوویەک دەچـووە سـەر ڕێگـاکەی. هـیچ قسـەیەکیان لەگەڵ یەک نەدەکـرد و کاتێـک لووتیـان بە لـووتی یەکـدا دەتەقـی، لە

ئەلـفەوە نەدەهـاتنە بـێ. هەر بەو هـۆیەش هـیچ کامیـان ڕاسـتەوخۆ نەدەچوو بۆ ژوانگەکە و تەنیا هەوڵیان دەدا لە ڕێگا تووشی یەک بن.

دارستانەکە تەنیا جێیەک بوو کە دەیانتوانی یەکتری ببینن، چونکە ژنانی گوندنشین هەموو ڕۆژێ دەستیان دەدا گۆنی و دەچوون بۆ نێو دارستانەکە و پڕیـان دەکـرد لە گیـاوگژ و دەیانهێنیـایەوە بـۆ مانگاکانیان. یۆڤگێنی ئەوەی دەزانی و هەر بەو هۆیە هەموو ڕۆژێ کـارەکەی وا ڕێکدەخسـت کە ڕێـی بکەوێـتە ئەو لایە و چـاوی پێـی بکەوێ. هەموو ڕۆژێکیش بڕیاری دەدا نەچێ بۆ ئەو لایە. بەڵام بێ ئیختیار هەست و هەنگاوی بۆ ئەولایەی هـان دەدا. کاتێکیش گوێی لە دەنگیان دەبوو لە پشت دەوەنێک ڕادەوەستا و بە دڵەکوتێوە دەیڕوانی بزانێ ئەوە بەوێدا تێدەپەڕێ یان نا.

ئەوەی کە دەیویسـت بزانـێ ئەوە لەوێـوە تێـدەپەڕێ یـان ژنێکـی دیکەیە، خۆشی نەیدەزانی. لە دڵی خۆیدا دەیگوت ئەگەر ئەو بێ و بە تەنیا بێ، خێرا تێی دەتەقێنم. لەگەڵ ئەوەشدا تـامەزرۆ بـوو بۆ بینینی. جارێک تووشی بوو. خەریک بوو پێی دەنـایە نێو دارستانەکەوە. کە چـاوی بە سـتپانیدا کەوت، لەگەڵ دوو ژنـی دیـکەی لادێیـی هەرکـام تەلیسێکیان گیاوگژ بە کۆڵیاندا دابوو و لە نێو دارەکان دەهـاتنە دەرێ. ئەگەر تۆزێک زووتـر بهاتبـایە، بە تەنیـا لە نێو دارستانەکەدا تووشـی دەبوو. بەڵام ئێسـتا سـتپانیدا نەیـدەتوانی لە بەرچـاوی ئەو دوو ژنەی دیـکە بگەڕێتەوە بـۆ نێـو دارسـتانەکە و دیـداری لەگەڵ تـازە بکـاتەوە. بەڵام یۆڤگێنی، ئەگەرچـی دەیزانـی ئەوە کـارێکی ئەسـتەمە، مـاوەیەکی زۆر لە پشـت لقوپـۆپی دار فنـدقێک ڕاوەسـتا و گـوێی بەوە نەدا کە لەوانەیە کەسـانێک بیبیـنن. سـتپانیدا نەگەڕایەوە و یۆڤگێنی مـاوەیەکی زۆر لەو شــوێنە مــایەوە. وزەی خەیــاڵی، ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ ژنەی لە

بەرچــاوی جــوانتر دەکــرد و ئەم جــۆرە چــاوپێکەوتنە نەک جارێــک، بەڵکوو شەش جار ڕووی دابوو، لەگەڵ تێپەڕینی زەمان ژنە زیاتر لە بەرچاوی شیرین دەبوو و بە تامەزرۆییەوە چاوەڕوانی هەلێک بوو کە بڕیـاری ژوانـی لەگەڵ دانـێ. ئەو هـیچ کـات ئەوەنـدە لە بەرچـاوی یـۆڤگێنی جـوان و سـەرنجڕاکێش نەبـوو و نەک هەر سـەرنجڕاکێش بەڵکوو بەو ڕادەیە دڵی نەخستبووە داوی خۆیەوە.

ئەو هەسـتی دەکـرد توانـایی بە سـەرکردەوەکانی خۆیـدا نیـیە و خەریکە شێت دەبێ. ئیتر قەڵای حەیا و ئابڕووی بە جێیەک گەیشتبوو کەفـوویەک دەڕووخـا. بە پـێچەوانە زۆر بە باشـی ئاگـاداری مەیـل و حەزە دزێـو و پڕ شـوورەییەکانی خـۆی بـوو و دەیزانـی چـوونی بـۆ دارستانەکە خۆی کردەوەیەکی لەو چەشنە بوو. دەیزانی کە شـوێنێکی تاریک و خەڵـوەتی بـۆ هەڵـکەوێ، یـان دەسـتی بیگـاتێ، لەڕێـوە خـۆی دەدۆڕێنـێ. ئەو دەیزانـی کە تەنیـا شـەرم کـردن لە خـۆی و خەڵـک لەو کــارەی دەگێــڕێتەوە و لە بارودۆخێــک دەگەڕا کە بــۆی هەڵــکەوێ و شوێنێک بدۆزێتەوە بۆ گەیشتن بە پلانەکەی و هیچ کەس پێی نەزانـێ؛ بۆ وێنە تاریکی یان پێوەندیی جەسـتەییی کە هەوەسـی حەیـوانی وای لێ بکات هەموو شەرم و شکۆیەک وەلا بنێ. بەم هۆیەش دەیزانـی کە تاوانبـارێکی بـێ شـەرمە و بە هەمـو توانـایەوە خەریـکە ڕۆحـی خـۆی دەخــاتە نێــو زەلکــاوێکی ڕەشــەوە و لەگەڵ ئەوەشــدا ڕقــی لە خــۆی هەستابوو، چونکە هێشتا خۆی بە تەواوی نەدۆڕاندبوو. هەموو ڕۆژێ داوای لە خودا دەکرد کە توانایی پێ ببەخشێ و لەو زەلکاوە ڕزگـاری بکــات، هەمــوو ڕۆژێ بڕیــاری دەدا کە ئیتــر هەنگاوێــک بەو ڕێگــایەدا نەڕوا و چــاو لە دووی ئەو ژنە نەبــێ و لە بیــر خــۆی ببــاتەوە. هەر

ڕۆژەی تەگبیرێکی دەکرد کە ڕۆحی خۆی لەو گێژاوە دەرکێشێ و ئیتر بە لاڕێدا نەڕوا. بەڵام هەوڵەکانی هەمووی بێ ئاکام بوون.

یەکێک لەو تەگبیرانە خۆ خەریک کردن بە کارێکی هەمیشەییەوە بوو. یەکێکی تریان زێدەڕەوی لە چالاکیی جەستەیی و ڕۆژوو گرتن بوو. سێهەمیش ئەوە کە بیهێنێتە بەرچاوی خۆی کاتێک ژنەکەی و خەسووی و هەموو خەڵکی، لەو کارە چەپەڵ و بێڕەوشتییەی ئاگادار بن، چۆن دەکەوێتە ژێر هەرەسی شەرمەزاری و لە بەرچاویان ڕەش دەبێ. بیری لەو تەگبیرانە دەکردەوە و هەوڵی دەدا و بە خەیاڵیدا دەهات کە بە سەر ویستە چەپەڵەکەیدا زاڵ بووە، بەڵام کە نیوەڕۆ دەهات و بیری لە ژوانەکانی ڕابردووی دەکردەوە، و هەروەها ئەو کاتەی بە کۆڵی گیاوگژەوە لە نێو دارستانەکە دیتبووی، هەستی دەکرد ئێستا دەبێ لەوێ بێ و بە هەڵەداوان بەرەو لێڕەوارەکە ملی ڕێی دەگرت.

پێنج ڕۆژ بەو شێوەیە تێپەڕی. ئەو هەموو ڕۆژێ ژنەی لە دوورەوە دەدی، بەڵام لێی نزیک نەدەبۆوە.

# شازده

لیزا وردەوردە خەریک بوو چاک دەبۆوە. هەستابۆوە و بە ڕێدا دەڕۆیشت. ئەو گۆڕانەی بە سەر حاڵ و هەڵسوکەوتی مێردەکەیدا هاتبوو، تووشی خەم و فیکر و خەیاڵی کردبوو، بەڵام هەرچی هەوڵی دەدا سەری لێی دەرنەدەچوو.

ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنا، بە شێوەی کاتی ڕۆیشتبوو و لە میوانەکان تەنیا مامی یۆڤگێنی لەوێ مابوو. ماریا پاولۆڤنا وەک جاران لە ماڵێ بوو.

یۆڤگێنی لەو گێژاوی هەوەس و دڵەخورپێدا کەوتبووە پەلەقاژە و خەریک بوو شێت دەبوو. دوای زریان و ڕەشەبای مانگی ژوئەن، کە ئاساییە و ڕێژنەبارانی توند دادەکات و ئەمجارەش دوو ڕۆژی خایاند و ڕێژنە و گۆپاڵەباران خۆشی نەکردەوە. باران پەکی هەموو کارێکی پێ خستبوون. زەوی زەلیبوو و تەنانەت نەیاندەتوانی لە بەر تەڕوقوڕی پەینیش بکێشن بۆ مەزرا. خەڵکی هەموو لە ماڵێ مابوونەوە. شوان و گاوان نەیاندەتوانی ماڵات بەرن بۆ لەوەڕگە و لە گەوڕ و گەلەخانەدا دایانکردبوون. هێندێکیش کە لە سەحرا خۆیان نەگرتبوو و مێگەل و گاڕانەکەیان بۆ نەحاوابۆوە گەڕابوونەوە بۆ ئاوایی و گۆپاڵەباران مەڕ و مانگای لە کۆڵاناندا بەلەسە کردبوو و ژنانی گوندنشین بە پێخاوسی و سەری بە لەچکە پێچراوەوە بە شوێن ئاژەڵەکانیاندا دەگەڕان و بۆ ماڵێیان دەبردنەوە. شیو و

جۆگەکان لێوڕێژ بوون لە لافاوی لێڵی بەخوڕ و گژوگیا و گەڵا گەش و پاراو ئاویان لێ دەچۆڕا. یۆڤگێنی لە ماڵێ و لە لای هاوسەرەکەی دانیشتبوو. هەردووکیان مات و خەیاڵاوی بوون و یۆڤگێنی لە خەیاڵی ستپانیدا و لیزا لە خەیاڵی مێردەکەیدا. لیزا چەند جار هۆکاری ئەو دڵتەنگی و بێتاقەتییەی لە مێردەکەی پرسیبوو، بەڵام یۆڤگێنی بە وەڕەزییەوە وەڵامی دابۆوە کە هیچی نییە و لیزاش ئیتر پرسیاری لێ نەکردبوو، ئەویش وەک مێردەکەی پیشی خواردبۆوە و مات دانیشتبوو.

ناشتاییان خواردبوو و لە ژووری میوانداری دانیشتبوون. مامی یۆڤگێنی چیرۆکی سەبارەت بە هاوڕێ خانەدانەکانی ڕێکخستبوو و بۆ سەدەمین جار دەیگێڕایەوە، لیزاش خەریکی چنینی شتێک بوو، هەناسەیەکی هەڵکێشا و هاواری پشتی کرد. مامی یۆڤگێنی داوای لێکرد بچێ ڕاکشێ و بە خزمەتکارەکەش بڵێ قاپێک ڤۆدکا بۆ ئەو بێنێ. یۆڤگێنی لە ماڵێ دڵتەنگ و لەش داگیراو دانیشتبوو، هەستی دەکرد دار و دیوار و کەلوپەلی ماڵێ هەمووی خەمی لێ دەبارێ. کتێبی دەخوێندەوە و جگەرەی دەکێشا. بەڵام ئەوەی دەیخوێندەوە هەر تەقەی سەری دەهات و هیچی لێ تێنەدەگەیشت.

گوتی: «دەبێ بچم چاو لەو چەرخە سماتانە بکەم کە دوێنێ هێناویانە.» هەستا و ڕۆیشتە دەرێ.

ـ چەترێک بەرە، تەڕ دەبی!

ـ نا، پێویست ناکا. باڵتەی قایشم لە بەردایە. دوور ناڕۆم، تەنیا دەچم بۆ کارخانە.

جزمەکانی لە پێ کرد و باڵتە قایشەکەی کردە بەری و ڕۆیشت بۆ کارخانەکە. بەڵام هێشتا بیست هەنگاو لە ماڵێ دوور نەکەوتبۆوە

چاوی بە ستپانیدا کەوت بەرەوڕووی دەهات، داوێنی کراسەکەی بە لادا کردبوو و پووز و بەلەکە سپی و ناسکەکەی هەتا ئەژنۆی بە دیارەوە بوو. بە نێو قوڕ و چلپاوەکەدا هەنگاوی دەنا و ئەو شاڵەی سەر و شانی پێ داپۆشیبوو، بە دەستی ڕاستەوپاستەی کرد و لە خۆی پێچا.

وەک ئەوەی نەیناسیبێ، لێی پرسی: «بۆ کوێ دەچی؟» بەڵام کە ناسییەوە، ئیتر لە جێی خۆی وشک بوو. ستپانیداش ڕاوەستا و زەردەخەنەیەک لێوی نەخشاند و ماوەیەک لە ژێر لێزمەی بە خوڕی بارانەکەدا چاویان لە یەک بڕی.

ـ گوێرەکەیەکمان نەهاتۆتەوە، بە دوای ئەودا دەگەڕێم. نازانم خۆی بە ماڵی کێدا کردووە! ئەی تۆ بەو باران و لەنگێزەیە بۆ کوێ دەچی؟

ئەو پرسیارەی هێندە خۆمانە بوو دەتگوت هەموو ڕۆژێ چاوی پێی کەوتووە و هێندە لێک نزیکن موو بە بەینیاندا ناچێ.

یۆڤگێنی لە ناکاو و بێ ئیختیار، کە خۆشی نەیزانی چۆن بوو پێی گوت: «وەرە بۆ ماڵۆچکەکە!» بە جۆرێک ئەو ڕستەیە لە زاری دەرپەڕی کە دەتگوت کەسێکی تر ئەو وشانەی لە زاری ئەوەوە دەربڕیوە.

ستپانیدا لوی شاڵەکەی بە ددانی گرت و چاوێکی لێ داگرت، پاشان بە هەڵەداوان بەو ڕێگایەدا داگەڕا کە دەچوو بۆ ماڵۆچکەی نێو دارستانەکە، یۆڤگێنی بە ڕێگای خۆیدا سەری داخست و ڕۆیشت، دەیویست لە نزیک یاسە بنەوشەکەوە بایداتەوە و بەرەو دارستانەکە ملی پێوەنێ.

کەسێک بانگی کرد: «ئاغا، ئاغا، خانم کاری پێتە. دەڵێ بگەڕێتەوە بۆ ماڵێ کارم پێیەتی.»

میشای خزمەتکاریان بوو.

یـۆڤگێنی لە دڵـی خۆیـدا گـوتی: «خـودایە، ئەوە دووهەمـین جـارە نەجـــاتم دەدەی!» بەپەلە گەڕایەوە. ژنەکەی وەبیـــری هێنـــایەوە کە بەڵێنی داوە کاتی فراوێن دەوا بۆ ژنێک بەرێ و ئێستا داوای لێدەکرد ئەو دەوایەی بۆ ببات.

پێـنج خـولەک ڕاوەسـتا هەتـا دەواکەیـان هێنـا. پاشـان دەواکەی هەڵگـرت و وەڕێـکەوت، لە دڵـی خۆشـیدا بڕیـاری دا نەچێـت بـۆ لای مـاڵۆچکەکە. چـونکە ترسـی ئەوەی بـوو لە پەنـجەرەی مـاڵێوە بیبیـنن. بەڵام کاتێک دوورکەوتەوە و زانیی لە ماڵێوە دیار نییە، خێرا بایدایەوە ڕۆیشت بۆ لای ماڵۆچکەکە. دەیهێنایە بەرچاوی خۆی کە ئێستا ژنە لە نێوەڕاستی کەوێڵەکەدا ڕاوەستاوە و تامەزرۆیانە چاوەڕوانیەتی. بەڵام کە گەیشتە نێو کەوێڵەکە هـیچ کەسـی لـێ نەبوو، هـیچ ئاسـەوارێکیش بەرچـاو نەدەکەوت کە نیشـاندەری هـاتنی ژنە بـێ بـۆ ئەو شـوێنە. لە دڵی خۆیدا گوتی ڕەنگە ژنە هەر نەهاتبێ و تەنـانەت لەوانەیە گوێی لە قسەکەی نەبووبێ و لە مەبەستەکەی تێنەگەیشتبێ. ئەو لە ژێر لێوەوە ورتەیەکی لێ هـاتبوو، وەک ئەوەی بترسـێ کە ژنە لە قسـەکانی تێبگا. «یـان لەوانەیە هەر حەزی لە هـاتن نەبـووبێ. نـازانم بـۆ لەخـۆڕا پـێم وابـوو بە تـامەزرۆییەوە خـۆ دەخـاتە باوەشـمەوە؟ ئەو مێـردی هەیە، تەنیـا مـنم کە هێنـدە سـووکوچرووکم، بە سـەر ئەو ژنە چـاک و دڵسـۆزەمدا، بە دوای ژنێکـی تـردا هەڵـدێم و خەریکـم ئـابڕووی خـۆم دەبەم!» سـەربانی ژوورەکە تلیسـابۆوە و دڵـۆپەی دەکـرد. هەڵاشـی میچەکە خووسـابوو و دڵۆپە تەرکی کەوێڵەکەی تەڕ کردبوو. لە ژێر دڵۆپەدا هەڵترووشکا و بیری کردەوە: «بەڵام زۆر خـۆش دەبوو لێرە بـوایە، تەنیـا لە ژێـر بـارانەدا و لەم کەوێـڵە چـۆڵ و لاپەڕەدا لەگەڵـی

بووماﻳﻪ. خۆزگە بهاتبايە و لانيکەم جارێکی تر پڕ بە دڵ لە باوەشم بگرتايە و پاشان هەرچی دەبێ با ببێ!» بەڵام بيری کردەوە: «بەڵام لەوە ناچێ هاتبێ، ئەها ئەگەر هاتبێ حەتمەن جێگاپێيەک، شتێکی لێرە بەجێماوە و دەکرێ بيدۆزمەوە.» ئەو کوێرەڕێيەی کە دەهات بۆ کەوێڵەکە بێ گژوگيا و ڕووتەن بوو، چاوی پێدا گێڕا و جێگاپێيەکی پێخاوسی دی کە لە جێيەک هەڵخليسکابوو. «بەڵێ، ئەو هاتبوو، بەڵام، ئێستا ئيتر لێبڕاوانە بڕيارم داوە. لە هەر شوێنێک بيبينم دەچم بۆ لای. هەر ئەمشەو دەچم بۆ ژوانی!» ماوەيەکی زۆر هەروا لە نێو کەوێڵەکەدا هەڵترووشکا و چاوی لە کوێرەڕێگاکە بڕی، بەڵام دوای چاوەڕوانييەکی زۆر، شەکەت و بێهێز هاتە دەرێ و گەڕايەوە بۆ گوندەکە. دەواکەی برد بۆ پيرێژنەکە و گەڕايەوە بۆ ماڵێ. خۆی کرد بە ژوورەکەيدا و لە سەر قەرەوێڵەکەی دانيشت و چاوەڕێ بوو نانی نيوەڕۆ ئامادە بێ.

## حەڤدە

بەر لە نـانی نیـوەڕۆ، لیـزا هـات بـۆ لای و بەردەوام بیـری لەوە دەکردەوە کە هۆی دڵتەنگی و نارەزایەتیی مێردەکەی دەبێ چی بێ. گوتی کە لەوە دەترسێ بۆ زایمـان بیبەن بۆ مۆسکۆ و ئەو نـایهەوێ بچێ و بڕیاری داوە هەر لێرە لە لای بمێنێتەوە. هەروەهـا گوتی حەز ناکـا بچێت بـۆ مۆسـکۆ و ئاسـمانیش خـۆ لە عەرزدا نـاچێ. یـۆڤگێنی دەیزانـی ژنەکەی چەنـدە لە زایمـان دەترسـێ و چەنـدەش نیگەرانـی ئەوەیە کە منـداڵێکی مجـرۆی ببـێ، بەو هـۆیە زۆر نـارەحەت بـوو کە دیتی ژنەکەی چەندەی خۆش دەوێ و ئاوا بە ئاسانی و دڵفراوانییەوە ئامادەیە فیداکاری بکات. دیتی لە ماڵەکەیدا هەموو شتێک بە باشـی و ڕێکوپێکی بەڕێوە دەچێ و لێوڕێژە لە سەفا و پاکی، بە پێچەوانەش ڕۆحـی ئەو کەلاوڕێـژە لە دزێـوی و ناپـاکی و هەوەس دڵ و نـاخی ڕەش داگیـراوە. یـۆڤگێنی ئەو شـەوە خەو نەچـووە چـاوی و ئـازاری ئەوە هەڵیدەچۆقاند کە سەرەڕای بێزاری لەو ئاکارەی خۆی و بڕیاری لێبڕاوانەی بۆ پساندنی پێوەندی لەگەڵ ستپانیدا و هەڵکەندنی ڕەگی ناپاکی لە دڵی خۆیدا، دەیزانی دیسان بەیانی بێخی هەوەسەکە لە دڵیدا هەڵەسوون دێنێتەوە.

لە ژوورەکەی خۆیـدا دەهـات و دەچـوو و لە دڵـی خۆیـدا دەیگـوت: «نـا، ئەوە مەحـاڵە. دەبـێ ڕێگـایەک بـدزۆمەوە بـۆ دەربـاز بـوون لەو تەنگژەیە. خودایە گیان چبکەم؟»

کەسێک بە دابی فەرەنگیان بە قامک لە دەرگاکەی دا. دەیزانی مامیەتی. گوتی: «فەرموو!»

مامی وەک نێردراوێکی خۆهەڵبژاردوو لە لایەن لیزاوە هاتبوو. گوتی: «کوڕەکەم، من دەزانم تۆ زۆر گۆڕاوی و ئەوەش تێدەگەم کە ئەم بارودۆخە چەندە لیزا ئازار دەدا. من تێدەگەم کە زۆر دژوارە بە لاتەوە کاروبارت کە ڕووی لە گەشانەوەیە، بەجێی بێڵی و بڕۆی بۆ مۆسکۆ. بەڵام چیت دەوێ[17]؟ ئەگەر بە قسەی من دەکەی لێرە بڕۆن. ئەگەر بڕۆن، هەردوکتان ئارام دەبنەوە و من وای بە باش دەزانم بچن بۆ کەریمە. ئەوێ ئاووهەوایەکی باشی هەیە و مامانی زۆر بێوێنەشی لێیە. ئێستاش ئەگەر بڕۆن ڕاست وەرزی ترێیە.»

یۆڤگێنی لە ناکاو گوتی: «مامە کیان، ئەگەر نهێنییەک لە لای ئێوە بدرکێنم ئاشکرای ناکەن؟ ڕازێکە کە زۆر ترسناکە و بەڕاستی هۆی شەرمەزارییە بۆم!»

- بڵێ کوڕی خۆم! بۆ گومانت لە نهێنی پارێزیی من هەیە؟

یۆڤگێنی گوتی: «مامە گیان، تۆ دەتوانی یارمەتیم بدەی و نەک هەر یارمەتی، دەتوانی ڕزگاریشم بکەی.» بیری ئەوەی کە نهێنییەکەی لە لای مامێک بدرکێنێ کە خۆی ڕێزی بۆ دانانێ و ئەوەی کە لە بەرچاوی مامی سووک دەبێ، بە لایەوە ناخۆش و دژوار نەبوو. هەستی دەکرد مرۆڤێکی زۆر سووکوچرووک و تاوانبارە و دەیویست خۆی سزا بدات.

مامی گوتی: «بڵێ کوڕەکەم، تۆ خۆت دەزانی گە چەندەم خۆشدەوێی» زۆر دڵخۆش بوو کە برازاکەی ڕازێکی هەیە و

---

17- Que veux tu

ڕازەکەی پڕ شەرمەزارییە و دەیهەوێ پرێسکەی ئەو ڕازە لە لای ئەو بکاتەوە و ئەو لەو ڕێگایە دەیتوانی بەکەڵک بێ.

ـ بەر لە هەموو شتێک دەبێ پێت بڵێم کە من مرۆڤێکی زۆر سووکوچرووکم، مرۆڤێکی خوێڕی و بێشەرەف.»

پیرەپیاو واق ورماوانە گوتی: «ئەو قسانە چییە دەیکەی کوڕەکەم؟»

ـ دەی چۆن خوێڕی و سووکوچرووک نیم؟ لە جێیەک کە من، مێردی لیزا، بەڵێ، لیزایەک کە خۆت دەزانی پاکی و خۆشەویستیی دەرهەق بە من چۆنە، بەڵێ، من مێردی ئەو، دەمهەوێ خیانەتی پێ بکەم. ئەویش کێ؟ دەمەوێ لەگەڵ ژنێکی لادێیی دەست تێکەڵ بکەم!»

ـ چیت گوت، دەتەوێ خیانەتی پێ بکەی؟ کەوایە هێشتا نەتکردووە؟

ـ با، کارێکم کردووە کە لەگەڵ خیانەت هیچ جیاوازییەکی نییە. چونکە خیانەت نەکردنەکەم پێوەندیی بە خۆمەوە نەبووە. من ئامادە بووم خیانەت بکەم، بەڵام نەیانهێشت بیکەم ... ئەگەر وا نەبوایە ئێستا ... ئێستا ... نازانم چیم کردبوو!

ـ نا، پەلە مەکە، بۆم ڕوون بکەوە ...

ـ باشە، با ڕوونتر پێت بڵێم. کاتێک سەڵت بووم گەوجێتیم نواند و لەگەڵ یەکێک لە ژنەکانی ئێرە کەینوبەینم ساز کرد. لەگەڵ یەکێک لە ژنانی ئەم گوندە. من ئەوم لێرە، لە نێو دارستانەکە و لە سەحرا دەدی و ...

مامی گوتی: «جوان بوو؟»

یۆڤگێنی بەو پرسیارەی مامی گرژ بوو. بەڵام هێندەی پێویستی بە یارمەتیی ئەو بوو کە وای نواند گوێی لێ نەبووە و درێژەی بە قسەکانی دا: «بەڵام من ئەو کاتە پێم وا بوو پێوەندییەکی زووتێپەڕە و زوو لێی دادەبڕێم و هەموو شتێک کۆتایی پێدێ. هەڵبەت بەر لە زەماوەندەکەم لێی دابڕام و نزیکەی ساڵێک چاوم پێی نەکەوت و بیرم لێ نەکردەوە.»

یۆڤگێنی خۆشی بە بیستنی وەسف و شی کردنەوەی حاڵی خۆی تووشی سەرسووڕمان ببوو. «پاشان، لە ناکاو، خۆشم نازانم چۆن، هەر بەڕاستی هێندێ جار بڕوا بە ڕۆح و تاپۆکان دەکەم ـ ئەوم دیت و کرمی هەوەس لە دڵمدا کەوتە جموجۆڵ و خەریک بوو لە ناخەوە دەیخواردم. من جنێوم بە خۆم دەدا چونکە ئاگام لەو کردەوە چەپەڵ و ڕەشەی خۆم هەبوو، یانی ئەوەی کە هەموو ساتێک لەوانەبوو خۆم تووش بکەم و بە پێی خۆم بۆ لای بخوشێم و خۆم تێوەگلێنم، ئەگەر ئێستاش تووشی ئەو کردەوە جەپەڵە نەبووم، هی ئازایەتی خۆم نییە، خودا لەو کارەی گێڕاومەتەوە. هەر دوێنێ چووم بۆ لای، بەڵام لیزا کەسێکی نارد بە دوامدا و بووە هۆی ئەوەی نەکەومە نێو ئەو زەلکاوەوە.»

ـ چۆن؟ لەبەر ئەو بارانەیە؟

ـ بەڵێ، مامە گیان. دەزانی چ ئازارێکم کێشا. بڕیارم دا کولۆکۆی دڵم لە لای تۆ هەڵڕێژم و داوای یارمەتیت لێ بکەم.

ــ هەڵبەت ئەو جۆرە کارانە. ئەویش لە ملکەکەی خۆتدا زۆر نەشیاوە. خەڵکی دەزانن و پیاو حەیا و ئابڕووی دەچێ. من دەزانم لیزا ژنێکی لاوازە و دەبێ دڵی ڕاگری. بەڵام بۆچی لە ملکەکەی خۆتدا؟

یۆڤگێنی دیسان وای نواند کە گوێی لە قسەکەی مامی نەبووە و زۆر بە پەلە چووە سەر قسەکانی.

ـ بەڵێ مامە گیان، من لە چنگ خۆم، لە چنگ ئەو دێوەی لە ناخمدا خۆی مەڵاس داوە، ڕزگار بکە. تکات لێدەکەم مامە گیان یارمەتیم بدە. پێم بڵێ چبکەم؟ ئەمڕۆ بە هەڵکەوت بەربەستێک هاتە سەر ڕێگام و لەو کارەی گێڕامەوە. سبەینێ بۆم هەڵکەوێ و ڕێگام بۆ بکرێتەوە، خودا دەزانێ چی دەکەم و چۆن ... ئێستا ئیتر ئەویش دەزانێ. مامە گیان! مەهێڵە بە تەنیا بم.

مامی گوتی: «باشە، قەبوولمە، بەڵام پێم بڵێ تۆ بەڕاستی ئاشق بووی؟»

ـ نا نا! ئەشق لە گۆڕێدا هەر نییە. وزەیەکی سەیرە کە منی دیل کردووە. من نازانم چبکەم. ڕەنگە غیرەت وەبەر خۆم بنێم و ئەو کاتە...

مامی گوتی: باشە، هەر ئەوەیە، کەوایە بە بڕوای من بەو ڕێگایەدا بڕۆ کە پێم گوتی. هەمووومان دەچین بۆ کەریمە!

ـ بەڵێ، بەڵێ، دەڕۆین، بەڵام هەتا ئەو کاتەی لەگەڵ ئێوەم، قسەتان لەگەڵ دەکەم.

# هەژدە

یۆڤگێنی کێشـە و گـرفتەکەی خـۆی لەگەڵ مـامی هێنـایە گـۆڕێ و لەوەش گرینگتر ئازاری ویژدا و باری قورس و پڕ لە ژانی شـەرمێک کە دوای ئەو بارانە ڕۆژە تامڵی کردبوو، وەخۆی هێنـایەوە. لە مـاوەی حەوتوویەکدا لێبـڕاوانە بڕیاریـان دا بچـن بـۆ یالْتـا[18]. لەو حەوتـووەدا یۆڤگێنی چـوو بـۆ شـار و پـارەی پێویسـتی بـۆ ئەو سـەفەرە جێبەجـێ کرد. بۆ کاروبار و بەڕێوەبردنی ملْکەکەشی کەسانی شیاوی هەڵبژارد و دەستووری پێویستی پێدان. دڵی ئارام بۆوە و جـارێکی تـر نەشـەی ڕابــردوو و هەســتی نزیکــایەتی لە ژنەکەی و هەســت و ســۆز و خۆشەویستی لە ناخیدا ژیایەوە.

دوای ئەو ڕووداوەی بارانەڕۆژەکە ئیتر تەنانەت بۆ تاقەجارێکیش چــاوی بە ســتپانیدا نەکەوت و لەگەڵ ژنەکەی چــوون بــۆ کەریــمە. ماوەی دوو مانگ لە کەریمە مانەوە و زۆر خۆشیان ڕابوارد. یۆڤگێنی هێندەی شـتی تـازە دی و هەسـتی خـۆش و شـیرین نـاخی داگـرت، کە پێی وا بـوو تەواوی نـاحەزی و چەپەڵییەکـانی ڕابـردوو لە سـەر دڵ و داڵغەی سڕاونەتەوە. لە کەریمە چاویان بە هاوڕێ و دۆستانی قەدیمی کەوتەوە و پەیمانی دۆسـتایەتییان تـازە کـردەوە و زۆر لە یەک نزیـک بوونەوە، هەروەها زۆریان دۆست و هاوڕێی تازە پەیدا کـرد. ژیـان لە

---

١٨- یالْتا ناوەندی کەریمەیە لە ڕۆخی دەریای ڕەش

کەریـمە بـۆ یـۆڤگێنی جێژنێکـی بەردەوام بـوو و جـگە لەوەش زۆر بەکەڵـک، سـەرەڕای ئەو شـادی و ڕابواردنـانە زۆر شـتی نـوێش فێـر بـــوو. لەوێ لەگەڵ ســــەرۆکی پێشـــووی کـــۆڕی خانەدانەکـــانی پارێزگاکەیان ناسیاویی پەیدا کرد کە پیاوێکی جوامێر و تێگەیشتوو بوو. ئەو یۆڤگێنی کەوتە بەر دڵ و زۆر مەسـەلە و لایەنـی پێ ناسـاند و ئەوی کردە لایەنگری خۆی. لە کۆتـایی مـانگی ئووتدا لیزا کچێکـی جــوان و تەندروســـتی بـــوو و زایمـــانەکەی بە پـــێچەوانەی ئەوەی چاوەڕوانی دەکرا، زۆر ساکار و بێمەترسی بوو.

مـانگی سـێپتامبر گەڕانەوە بـۆ گونـدەکەی خۆیـان و ئەمجارەیـان بووبـوونە چـوار کەس. چـونکە دایەنێکیشـیان بـۆ سـاواکەیان گرتبـوو. لیزا مەمکی شیری تێدا نەبوو و بۆیە دایەنیـان بـۆ منداڵەکەیان پەیدا کـرد. یـۆڤگێنی ئەو ڕەنـج و خەفەتـانەی ڕابـردووی بە تەواوی لە بیـر چووبـۆوە و بووبـووە پیـاوێکی تـر و هەسـتی بە بەختەوەری دەکـرد. دوای تامڵ کردنـی ئەو ئـازارانەی پیـاوان لە کـاتی زایمـانی ژنەکانیاندا دەیکێشـن زۆر زیـاتر لە جـاران ئەشـق و خۆشەویسـتیی ژنەکەی لە دڵیدا سـەری هەڵدابوو. کاتێک کۆرپەکەی لە بـاوەش دەکـرد، سـەبارەت بە ئەو هەسـتێکی بـوو کە زۆر بە لایەوە تـازە بـوو، لەگەڵ ئەوەشـدا زۆر شیرین و پێکەنینـی و چەشـنی ختیلکەیەکی دڵخـواز بـوو. شـتێکی تـازەتر ئەوە بـوو کە ئێسـتا بە هـۆی نزیکـایەتی لە دوومچـین[19] (ئەو سەرۆکەی پێشووی کۆڕی خانەدانەکان) هۆگرییەکی تـازە سـەبارەت بە کاروبـاری پارێزگـا لە دڵیدا سـەری هەڵدابوو کە بڕێکـی لە تاسـەی ناوبانگ خوازییەوە سەرچاوەی دەگرت و هێندێکشی بۆ ئاگادار بوون

---

19- Duntchin

لە ئەرکــی سەرشــانی خــۆی دەگەڕایەوە. مــانگی ئوکتــۆبر کــۆڕی خانەدانی پارێزگا کۆبوونەوەیەکی تایبەتیان هەبوو، یۆڤگێنیش بڕیار بوو وەک ئەندامی ئەو کۆڕە هەڵبژێردرێ. کاتێک لە کەریمە گەڕایەوە، جارێک چوو بۆ شار و جارێکیش چوو بۆ دیدەنیی دوومچین.

ئەو ئازار و خەفەتانەی بە هۆی وەسوەسەی هەوەس و ململانێ کردن لەگەڵیدا تووشی بووبوو، لە بیری بردبۆوە و هەر بیریشی لێ نەدەکردەوە، زرۆ بە زەحمەتیش دەیتوانی بیهێنێتە بەر دیدەی خەیاڵی. ئەوانە لە بەرچــاوی وەک شــێتییەک دەچــوون کە ئەو گیــرۆدەی بووبوو.

هەستی دەکرد وەها لەو بەند و داوە ڕزگار بووە کە لە یەکەم دیداریدا لەگەڵ گزیرەکەی، کاتێک تەنیا کەوتن، بەبێ هیچ ترسێک سەبارەت بە ئەو پرسیاری لێکرد. چونکە پێشتر لەو بارەوە قسەی لەگەڵ کردبوو لە هێنانە گۆڕێی ئەو باسە هەستی بە شەرمەزاری نەکرد و لێی پرسی: «ئەو سیدۆر پچلنیکۆڤە[٢٠] هێشتا نەهاتۆتەوە لەگەڵ ژن و منداڵەکەی بژی؟»

ـ نا، هەر لە شار ماوەتەوە!

ـ ئەی ژنەکەی؟

ـ ژنێکی بێڕەوشتە. ئێستا لەگەڵ زینۆییێڤ[٢١] کەینوبەینی هەیە. تەواو شووی لێ هەڵکێشاوە!

یۆڤگێنی لە دڵی خۆیدا گوتی: «چاکتر، ئەو مەسەلەیە زۆر بە لامەوە بێهەمیەتە! من زۆر گۆڕاوم!»

---

20- Cidor Pchlnikov
21- Zinovyev

نۆزده

ئەوەی یـۆڤگێنی ئـارەزووی دەکـرد هـاتبووە دی. ملـکەکەی بـۆ مابۆوە و کارخانەکەشی لە گەڕدا بوو. بەرهەمی چەوەندەر زۆر باش بـوو و دیـار بـوو داهـاتێکی باشـی دەبـێ. ژنەکەی بە سـلامەتی منـداڵەکەی بووبـوو و خەسـووی ڕۆیشـتبۆوە و ڕۆحیـان ئاسـوودە ببوو. خۆشی لە هەڵبژاردندا زۆرینەی دەنگی هێنابۆوە.

دوای هەڵبـژاردن لە شـارەوە گەڕایەوە بـۆ مـاڵێ. هەمـووان پیرۆزباییـان پێـدەگوت و ئەو ناچـار بـوو وەڵامیـان بـداتەوە. نـانی نیـوەڕۆی خواردبـوو و سـێ بتڵـی شـامپانی هەڵچۆڕانـدبوو. چەنـد گەڵاڵەی نوێ بۆ ژیان لە زەینیدا سەریان هەڵدابوو و بە دەم ڕێگاوە بیـری لـێ دەکـردەوە، لە دوای هەڵبژاردنـی وەک ئەنـدامی کـۆڕی خانەدانەکانی پارێزگا، بە پلەوپایەیەک گەیشتبوو کە هەمیشە خەونی پێوە دەدی؛ یانی پلەوپایەیەک کە دەیتوانی لەو ڕێگایەوە خزمەت بە خەڵک بکات، نەک هەر لە ڕێگای وەبەرهێنان و دەرفەتی کار کردن، بەڵکوو لە ڕێگای دەسەڵاتی ڕاستەوخۆوە. بیری دەکردەوە کە لە سێ ساڵی داهاتوودا ڕەعیەتەکانی خۆی و هەروەها جووتیارەکانی دیکە سەبارەت بە ئەو چۆن بیر دەکەنەوە. لەو کاتەدا کە بە نێو گوندەکەدا تێـدەپەڕی، پیـاوێکی گوندنشـینی دی کە ژنێکـی لەگەڵـدا بـوو. ئەوان دەیانویسـت لە جادەکە بپەڕنەوە و یەکـی تەشـتێکی پڕیـان لە سـەر سـەریان دانـابوو. لە دڵـی خۆیـدا گـوتی: «هەر ئەوانە!» کـابرای گوندنشـین و ژنەکە ڕاوەسـتان کە فەیتـوونەکەی ئاغـا تێپەڕێ. کـابرا پچلنیکـۆڤی پیـر و ژنەکەش بـووکەکەی واتە سـتپانیدا بـوو. یـۆڤگێنی چاوێکی لە ژنە کرد و ناسییەوە، بەوەش دڵی خۆش بوو کە دیتی بە تەواوی لە داوی ئەشقی ئەو ڕزگار بووە و هەستی بە هێمنـایەتییەکی

ڕۆحی کرد. ژنە هەروەک جاران جوان و شۆخوشەنگ بوو بەڵام یۆڤگێنی زۆر بێ موبالاتانە بە لایدا تێپەڕی. گەیشتەوە ماڵێ. ژنەکەی بەرەو پیری هات بۆ بەرهەیوانی سەر قاڵدرمەکان. شەوێکی خۆش بوو.

مامی لێی پرسی: «دەی. ئێستا دەبێ پیرۆزباییت پێ بڵێین؟»

- بەڵێ، هەڵبژێردراوم.

ـ بژیی، کەوایە دەبێ بە بۆنەی ئەو هەواڵە خۆشەوە مەی فڕ بکەین!

بەیانیی ڕۆژی دوایی، سواری عارەبانەکەی بوو و ڕۆیشت بۆ سەردانی مووچە و مەزراکەی کە ماوەیەک بوو لێی غافڵ بوو. مەکینەی نوێی گێرە کردن لە سەر خەرمانەکە کاری دەکرد و یۆڤگێنی بۆ دیتنی شێوەی کار کردنەوەی ڕۆیشت بۆ نێو ژنانی کرێکار و هەولێی دا سەرنجیان نەدا و بێهەمیەت بێ، بەڵام هەرچی کردی نەیتوانی و دوو سێ جار چاوانی ڕەش و لەچکە سوورەکەی ستپانیدا سەرنجی ڕاکێشا. چەند جار بە لاچاوێک لە بەژنوبالای ژنەی ڕوانی و هەستی کرد دیسان شتێک خەریکە لە ناخەوە ختووکەی دەدا، بەڵام بۆی دەرنەکەوت چ جۆرە هەستێکە. ڕۆژی دواییش کە چوو بۆ سەرخەرمانەکە، نزیکەی دوو کاتژمێر بەبێ ئەوەی مانەوەی لەوێ پێویست بێ، بە لای مەکینەکەوە ڕاوەستا و بەردەوام چاوی لە سەر لەشولاری ژنە دەنیشتەوە و باڵی نیگای لە سینگ و بەرۆک و ڕوومەتی هەڵدەساوی و بۆی دەرکەوت کە داوی ئەشقی لە لاق و دڵی هالاوە و ڕزگار بوونی ئەستەمە. بە بارێک خەفەت و بێ هیواییەوە گەڕایەوە بۆ ماڵێ. دیسان ئەو ئازار و دڵەخورپە و ترس و

هیوابڕاوییانە وەک دۆڵپا سواری شانی ببوون و دەرووی ڕزگار بوونیان لێ تەنیبوو.

ئەوەی لێی دەترسا و چاوەڕوانی بوو، بە سەری هات. ڕۆژی دوایی، لای ئێوارە بێ ئەوەی خۆی بزانێ چۆن، گەیشتبووە پشت ماڵی ئەوان. لە بەردەرگای کادێنەکە، هەر ئەو جێگایەی کە جارێک لە وەرزی پاییزدا چووبووە ژوانی، ڕاوەستابوو. لەگەڵ ئەوەی وای دەنواند بۆ پیاسە کردن هاتووە و لەوێ ڕاوەستاوە، جگەرەیەکی داییساند. ژنی جیرانەکەیان چاوی پێی کەوت و لە گەڕانەوەدا گوێی لە دەنگی بوو کە لەگەڵ کەسێک قسەی دەکرد و دەیگوت: «بڕۆ، چاوەڕێتە. بە گیانی خۆم چاوەڕێی تۆیە. بڕۆ بۆ ژوانگەکەتان. بڕۆ ژنەتیوە شێتە!»

یۆڤگێنی دیتی ژنێک ـ ستپانیدا بوو ـ هەڵات بۆ لای کادێنەکە، بەڵام ئەو نەیتوانی بگەڕێتەوە چونکە مووژکێک چاوی لێ بوو. خێرا گەڕایەوە بۆ ماڵێ.

# بیست

کاتێک پێی نایە ژووری میوانداری، هەموو شتێک لە بەرچاوی سەیر و ناسروشتیی نواند. ئەو ڕۆژە بەیانی شاد و بەدەماخ لە خەو هەستابوو، لێبڕاوانەش بڕیاری دابوو کە ژنە لە بیر دەباتەوە و دەستی لێ بەردەدا، هەروەها ڕێگا بە خۆی نادا ئیتر بیر لەو کارانە بکاتەوە. بەڵام خۆشی نەیدەزانی چۆن. لە بەیانییەوە هەتا نیوەڕۆ دەستی بۆ هیچ کارێک نەچووبوو و بەردەوام هەوڵی دەدا خۆی لە کار بدزێتەوە. تەواوی ئەو شتانەی کە پێشتر گرنگیی پێ دەندان و دڵی پێیان خۆش بوو، ئێستا زۆر سووک و بێنرخ بوون لە بەرچاوی. بێ ئەوەی خۆی ئاگادار بێ، هەوڵی دەدا دڵی خۆی لە بەندی هەموو کارێک ڕزگار بکات. پێی وابوو دەبێ خۆی لە کاروبارەکان بدزێتەوە و گوێی پێ نەدا بۆ ئەوەی بیر بکاتەوە و گەڵاڵەی تازە دابڕێژێ. هەرواشی کرد، وازی لە کاروبار هێنا و بە تەنیا مایەوە. بەڵام هەرکە تەنیا کەوت، ڕۆیشت بۆ پیاسە و گەشت و گەڕان لە نێو باخ و لێڕەوار و دیتی هەموو شوێنێکی باخ و لێڕەوارەکە بە بیرەوەریی ئەو ڕمووده بووە، ئەو بیرەوەرییانە وەک مار لە دڵی دەهاڵان و ڕزگار بوونی دژوار بوو. پێی وا بوو لە نێو باخەکەدا پیاسە دەکات و بیر دەکاتەوە و بۆ ڕێگەچارەیەک دەگەڕێ، بەڵام بیری لە هیچ شتێک نەدەکردەوە و شێتانە و بەبێ هیچ هۆکارێک چاوەڕوانی ئەو بوو. چاوەڕوان بوو ژنە بە پەرجۆیەک

ئاگــادار بــێ کە ئەو چــاوەڕوانیەتی و دەیــهەوێ لە ئــامێزی بگــرێ. چاوەڕوان بوو ژنە بە زووترین کات بێ بۆ لای یان لە شوێنێکی دیکە بــۆی بێــتە ژوان کە دوور بــێ لە چــاوی خەڵــک و غەوارە. یــان لە شەوێکی هێندە ئەنگوستەچاودا بێتە ژوانی کە تەنانەت چاوی ژنەش ئەو نەبینێ. لە شەوێکی ئاوا تاریک و نووتەکدا بێت و ئەو بە کەیفی دڵی هەڵیگوشێ و بۆن بە سینگ و مەمک و لاملیەوە بکات و...

لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەڵێ، پێم وابوو هەرکاتێک لێی تێر بووم و ویستم لێی دابڕێم، دەتوانم؛ من بۆ تەندروستی خۆم لەگەڵ ژنێکی جوان و پاکوخاوێن تێکەوتم! بەڵام وا دیارە ناتوانم هەروا لەگەڵی ڕابوێرم و ئەو کارە بە یاری بزانم. من پێم وابوو ئەوم خستۆتە داوی خۆم و چێژی لێ وەردەگرم، بەڵام وا دیارە خۆم بوومەتە دیلی دەستی ئەو. ئەو منی لە داو خستووە و ئازادم ناکا. پێم وابوو ئازادم بەڵام ئازاد نەبووم، کاتێک ژنم هێنا خۆمم هەڵخەڵەتاند. هەموو شتێک خەیاڵ و خۆفریودان بوو. کاتێک دەستم لەگەڵ تێکەڵ کرد، هەستێکی تــازەم هەبــوو، هەســتی ڕاســتەقینەی مێردێــک، کە دەبــوو لەگەڵــی بمێنمەوە.

دوو جۆر ژیــان بــۆ مــن دەســت نــادا. یەکیــان ئەوەی لەگەڵ لیــزا دەستم پێکرد، یان ژیانی خزمەت و بەڕێوەبردنی کاروباری مڵک و بەڕێوەهێنانی ماڵ و منداڵ، هاوڕێ لەگەڵ ڕێزی خەڵکی. ئەگەر ئەم ژیانە پەسند بکەم، شوێنێکی بۆ ستپانیدا تێدا نییە. دەبێ ئەو جۆرەی بیرم لێکردەوە لێرەی دوور بخەمەوە، یان لە ناوی بەرم. ئەو نابێ بمێنــێ... ژیــان ئیتــر هەر ئەوەیە. یــان دەبــێ ســتپانیدا لە مێــردەکەی بستێنم و حاشای پێ بکەم یان پارەیەک بدەم بە مێردەکەی و شەرم و ئــابڕووچوون بــخەمە پشــت گــوێ و لەگەڵ ئەو بــژیم. بەڵام ئەگەر

ئەوە بکەم لیزا و میمی (میمی ناوی ساواکەیان بوو) نابێ هەبن. بەڵام نا، ئەو کۆرپەیە کۆسپی سەر ڕێم نییە. دەبێ بزانێ کە من ئەوم بە ژنێکی لادێیی فرۆشتووە. دەبێ بزانێ من پیاوێکی خاپینۆک و خوێڕیم. نا... ئەوە لە ڕادە بەدەر ترسناکە. ئەوە زۆر ئەستەمە. پاشان دەستی کرد بە بەڵگە هێنانەوە. بیری کردەوە: بەڵام لەوانەیە لیزا نەخۆش کەوێ و بمرێ. ئەگەر ئەو بمرێ، ئەم گرفتانە چارەسەر دەبن.

هەی ئافەرین بۆ بیر کردنەوەت! چارەڕەشی نێوچاوان تاڵ! نا، ئەگەر مردن لە گۆڕێدا بێ، وا باشترە ئەو بمرێ. ئەگەر ستپانیدا بمرێ، زۆر باشترە.

بەڵێ هەروایە، زۆر کەس ژن یا گراوی خۆیان دەرمانداو دەکەن یان دەیکووژن. وا باشە دەمانچەیەک هەڵگرم و بچم بانگی بکەم بۆ جێژوان و بە جێی باوەش لێ وەرهێنان، گوللەیەک لە سەر سینگی بدەم و ساردی بکەمەوە. ئاخر ئەو شەیتانە، شەتیانی ڕاستەقینەیە. ئەو بە پێچەوانەی ویستی خۆم داگیری کرووم. دەبێ بکوژرێ. یان ئەو یان ژنەکەم، یەکیان دەبێ بمرن. چونکە بەم شێوەیە ژیان مەحاڵە.[22] نا ئەم حاڵە بەو حاڵە ناشێ. دەبێ بیر بکەمەوە و چارەسەرێکی بۆ وەدۆزم. دەبێ پێشبینی بکەم. ئەگەر دۆخەکە بەم شێوەیە بمێنێتەوە چی ڕوودەدا؟

بەم شێوەیە دەبێ، من دیسان بەڵێن بە خۆم دەدەم کە وازی لێ دەهێنم و لە بیری دەبمەوە، بەڵام ئەوانە هەموو قسەیە و کە شەو بە

22 لێرە بە دواوە گێڕانەوەیەکی دیکەش بۆ ئەم چیرۆکە کراوە کە لە بەشی کۆتاییدا دەیخوێننەوە.

سەردا هات، دەڕۆم بۆ پشت ماڵەکەی و ئەویش دەزانێ و دێ بۆ لام. ئەی ئەگەر خەڵکی بزانن و چڵوچۆکەر بە ژنەکەم بڵێن؟ یان ئەگەر خۆم پێی بڵێم؟ چونکە ناتوانم درۆ بکەم و ناشتوانم ئاوا بژیم. ناتوانم، نا. چونکە دەزانن. هەموو خەڵک پێم دەزانن. ئابڕووم دەچێ و لە بەرچاوی خەڵک سووکوچرووک دەبم. پاراشا و ئاسنگەر هەموو پێدەزانن. بەڵام چبکەم؟ خۆ بەم شێوەیەش ژیان مەحاڵە.

نا، شتی وا مەحاڵە. تەنیا دوو ڕێگام لە بەردەمە. یان دەبێ ژنەکەم بکووژم یان ئەو. یان کارێکی تر. ئەها، بەڵێ. ڕێگایەتی تریش هەیە.» گوتی: «خۆم!» ئەوەی گوت و لە ناکاو تەزوویەک بە مۆغەرەی پشتیدا هات: «بەڵێ، دەبێ خۆم بکووژم، ئەو کاتە ئیتر پێویست ناکات ئەوان بکووژم!» ترس شکایە گیانی. ڕاست بەو هۆیەی کە هەستی کرد ئەوە تەنیا ڕێگەچارەیە. «دەمانچەم پێیە. بەڵام یانی بەڕاستی من دەبێ خۆم بکووژم؟ ئەوە بیرێکە کە هیچ کات بە زەینمدا نەهاتووە. زۆر سەیر دەبێ...»

گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی و خێرا چەکمەجەی ئەو مێزەی کێشایەوە کە دەمانچەکەی تێدابوو. بەڵام هێشتا دەمانچەکەی هەڵنەگرتبوو ژنەکەی خۆی کرد بوو ژوورێدا.

# بیست و یەک

یۆڤگێنی ڕۆژنامەیەکی کێشایە سەر دەمانچەکە.

ژنە بە ترسەوە چاوێکی لێکرد و گوتی: «دیسانیش؟»

- چی دیسانیش؟

ـ ئەو شێواوی و خەمۆکییەی پێشوو، ئەو کاتە نەتدەویست پێم بڵێی؟ گنیا[23]، خۆشەویستەکەم، پێم بڵێ. من دەزانم ئازار دەکێشی. پێم بڵێ. قسەم بۆ بکە. کوڵی دڵت لای من هەڵڕێژە و خۆت ئاسوودە بکە. نهێنییەکەت هەر شتێک بێ باشتر لەوەیە بەو شێوەیە ئازار بکێشی. من دەزانم کە ئەستەمە شتێکی خراپ بێ.»

- دەزانی چی! کاتێک...

- بیڵێ دەی، بیڵێ، من دەستت لە کۆڵ ناکەمەوە، دەبێ پێم بڵێی.

یۆڤگێنی زەردەیەکی گرت، زەردەیەکی دڵتەزێن!

- یانی بیڵێم؟ نا، شتی وا نابێ، ئەگەر بمهەوێ بیشیڵێم، چی بڵێم، خۆ ئەوە بۆ گوتن نابێ!

بەڵام ئەو جۆرەی لیزا هەڵیپێچابوو ئاخری ناچار دەبوو بیڵێ، بەڵام لەو کاتەدا دایەنی میمی هاتە ژوورێ و ویستی منداڵەکە بەرێتە دەرێ بۆ ئەوەی هەوایەکی تازە هەڵمژێ.

- باشە، کەوایە پێم دەڵێی! من تاوێکی تر دێمەوە.

---

٢٣- سووڵەکەناوی یۆڤگێنی

ـ بەڵێ، ڕەنگە ...

لیزا هیچ کات ئەو زەردەخەنە پڕ ئازارەی لە بیر نەبردەوە کە بە گوتنی ئەم دوو وشەیە کەوتە سەر لێوی مێردەکەی. بە دوای دایەنی میمیدا لە ژوورەکە چووە دەرێ.

یۆڤگێنی بەپەلە هەروەک دزێک دەمانچەکەی هەڵگرت و لە بەرگەکەی دەرکێشا. «پڕە. زۆر لەمێژە دەرم نەهێناوە. تەنیا گوللەیەکی لێ تەقاوە. ئێستا چبکەم؟»

لوولەی دەمانچەکەی بە لاجانگی خۆیەوە نا. ماوەیەک دوودڵ مایەوە. بەڵام هەرکە ستپانیدای وەبیر هاتەوە، بڕیاری خۆی بۆ نەدیتنی ئەو و دژواریی ململانێ و ترس و وەسوەسە و ئابڕووچوون و ململانێی دووبارەی هێنایە بەرچاوی خۆی و لەرزێک بە گیانیدا هات. بە خۆی گوت: «نا، ئەمە باشترین ڕێگایە.» قامکی بە پەلەپیتکەدا نا.

کاتێک لیزا بە هەڵەداوان گەڕایەوە بۆ ژوورەکە، (تەنیا ئەوەندەی پێچووبوو کە لە هەیوانەکە بچێتە خوارێ،) کە خۆی کرد بە ژووریدا دیتی یۆڤگێنی دەمەوڕوو لە تەرکی ژوورەکەدا کەوتووە و خوێنێکی ڕەش لە برینەکەی دێتە دەرێ، جەستەشی هێشتا جینگڵی دەدا.

زۆریان لێکۆڵییەوە، بەڵام هیچ کەس بۆی ڕوون نەبۆوە بۆچی خۆی کوشتووە یان هۆکارێکی بۆ بدۆزێتەوە. تەنانەت مامیشی بە بیریدا نەهات کە لەوانەیە خۆکوژییەکەی پێوەندی بەو دانپیانانەی دوو مانگ لەمەوبەریەوە هەبێ.

ڤارڤارا ئەلکسی یۆڤنا بە دڵنیاییەوە پێداگریی دەکرد کە هەمیشە پێشبینیی کردووە کە زاواکەی لە ئاکامدا خۆی بەو دەردە دەبا. بە شێوەی قسە کردنیدا ئەوەت بۆ دەردەکەوت. لیزا و ماریا پاولۆڤنا

هەرچـــی مێشـــکی خۆیـــان هەڵدەگوشـــی و بیریـــان لـــێ دەکـــردەوە نەیانـــدەزانی بـــۆ دەبـــێ ئەو ڕووداوە بقەومـــێ. باوەڕیـــان بە پزیشکەکانیش نەدەکرد کە گوتیان یۆڤگێنی بە هۆی ئاڵۆزیی مێشک و ئاوەزەوە خۆی تووشی ئەو بەڵایە کردووە. ئەوان بە هیچ شێوەیەک نەیاندەتوانی ئەوە بە خۆیان بسەلمێنن کە یۆڤگێنی بەو هۆیە خۆی کوشـــتووە، چـــونکە ئەو لە ســـەدان کەســـی خـــزم و ناســـیاوی دەوروبەریان ئاقڵتر و تەندروستتر بوو.

هەر بەڕاستیش ئەگەر یۆڤگێنی ئیرتنێڤ لە کاتی ئەو کارەساتەدا وەک شێت بێنینە ئەژمار، دەبێ هەموو خەڵک بە شێت و ناهیر بزانین. هەروەها شێتتر لە هەمووان بێ گومان ئەو کەسانەن کە شوێنەواری شێتی لە خەڵکیدا دەبینن بەڵام لە خۆیانیدا نابینن.

# گێڕانەوەیەکی تر

ئەوەی گوت و ڕۆیشت بۆ لای مێزەکە. چەکمەجەکەی کێشایەوە و دەمانچەکەی هەڵگرت. چاوی لە ساجوورەکەی کرد .

ـ تەنیا گوللەیەکی لێ تەقێندرابوو ـ دەمانچەکەی نایە گیرفانی پانتۆڵەکەیەوە.

لە ناکاو هاواری کرد: «خودایە چبکەم؟» هەردوو دەستی بۆ دۆعا کردن بەرز کردەوە: «خودایە یارمەتیم بدە و ڕزگارم بکە! خۆت دەزانی من نامەوێ خراپە بکەم. بەڵام بە تەنیا هیچم لە دەست نایە. یارمەتیم بدە.» ئەوەی گوت و لە بەردەمی وێنەی پیرۆزدا خاچی خۆی کێشا.

ـ بەڵێ دەتوانم خۆم ببینمەوە و بە سەر خۆمدا زاڵ بم. پیاسە دەکەم و بیر دەکەمەوە.

لە ژوورەکەوە چوو بۆ دیوی جلان و کوڵەباڵتەیەکی کەڵپۆسی لە بەر کرد، جووتێ پێڵاوی لە پێ کرد و بە قالدرمەکاندا چووە خوارێ. بەبێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ هەنگاوەکانی بە قەراغ تەیمانی باخەکەدا تێپەڕین و بە باریکەڕێیەکی نێو مەزراکەدا چوو بۆ ماڵۆچکەی مەزراکە. مەکینەی خەمارنکوت هەروا کاری دەکرد و قرموقاڵ و قاقای ئەو لاوانەی کاریان لە سەر دەکرد هاتە گوێی. چوو بۆ جاڕە گەنمەکە. ژنە لەوێ بوو. یۆڤگێنی لەڕێوە چاوی پێی کەوت. بێژنگێکی بە دەستەوە بوو و گوڵەگەنمی کۆ دەکردەوە. چەند ژنی

دیـکەش وەک ئەو خەریکـی گـوڵچنینەوە بـوون، یـان بـاقە گەنمیـان دەکێشـا بـۆ سـەر خەرمـانەکە. کە چـاوی بە ئاغـا کەوت، زەردەیەک ڕوخسـاری گەشـاندەوە و خێرا و چـالاکتر لە پێشـوو دەسـتی کـرد بە گوڵچنینەوە. یۆڤگێنی ئەگەرچـی نەیدەویسـت بەڵام نەیـدەتوانی چـاوی لـێ نەکـا. بەڵام کاتێـک سـتپانیدا لە بەرچـاوی لاچـوو و ڕۆیشـت بـۆ پشــت قەڵاتەیەکــی گەنــم، یــۆڤگێنی وەخــۆ هــاتەوە. فەرمــانبەری نووسینگەکەی پێی ڕاگەیاند کە مەکینەکە ئێستا کاری لێدانی گەنمەکە تەواو دەکــات و هەر بەو هــۆیەش کــارەکەی شــێنەییتر و ڕێــژەی دانەکەشی کەمترە. یۆڤگێنی لە مەکینەکە چووە پێشـێ کە جارجار بە هـۆی بـاخەی پـڕژ و بـڵاوەوە کە دەیـانکرد بە گەروویـدا جـووڵەیەکی توندی دەکرد. لە کارگێڕی نووسینگەکەی پرسی کە ئەم باقانە زۆرن؟

کارگێڕەکە گوتی: «پێنج عارەبانە دەبێ.»

ـ سەیرە! کەوایە ...

بەڵام قســەکەی تەواو نەکــرد. ســتپانیدا هــاتە پێشــێ و لە نزیـک مەکینەکە ڕاوەستا، دەیویست گوڵەگەنمەکانی ژێری کۆ بکاتەوە و بە نیگا پڕ بزەکەی ئاوری لە دڵی یۆڤگێنی بەردا.

ئەو ڕوانیــنە گەرم و پــڕ لە نــازەی لێــوڕێژ بــوو لە ئەشــق و شــادییەکانی ڕابــردوو. دەیگـوت کە دەزانــێ شــەیدا و دڵـدۆڕاوی و دەهاتی بۆ پشت ماڵەکەم. دەیگوت ئەویش وەک هەمیشە باری منەتی دەکێشێ و ئامادەیە لەگەڵیدا شاد بێ، ئەشق و نەشـە ڕۆحی دابگرێ و گـوێ بە بـارودۆخی ئەمـڕۆ و ئاکـامەکەی سـبەینێی نـادا. یـۆڤگێنی هەسـتی کـرد کە دیلـی ئەوە و نـاتوانێ خـۆی لە داوی ڕزگـار بکـات، بەڵام نەیدەویست خۆی بە دەستەوە بدات.

دۆعاکەی خۆی وەبیر هاتەوە و هەوڵی دا دیسان دووپاتی بکاتەوە. لە دڵی خۆیدا دەستی کرد بە دۆعا کردن بەڵام بۆی دەرکەوت هەوڵەکەی بێ ئاکامە.

ئێستا تەنیا بیرێک بە سەر وجوودیدا زاڵ بوو، ئەویش ئەوە بوو کە چۆن بەدوور لە چاوی خەڵکی بڕیاری ژوانی لەگەڵ دانێ.

کارگێڕەکەی پرسیی: «کاتێک ئەمانەمان تەواو کرد، دەست بکەین خەرمانێکی تر یان هەڵیگرین بۆ سبەینێ؟»

یۆڤگێنی کە بێ ئیختیار چاوی بە دووی ژنەدا دەخوشی، هەتا گەیشتە لای قەڵاتەیەکی تر و لەگەڵ ژنێکی دیکە دەستی کرد بە کۆ کردنەوەی باقە، چاوی لەسەر هەڵنەگرت، لە وەڵامی کارگێڕەکەیدا گوتی: «بەڵێ، بەڵێ... »

لە دڵی خۆیدا گوتی: «یانی من بەڕاستی ناتوانم بە سەر هەستی خۆمدا زاڵ بم و خۆم لەم بەندە ڕزگار بکەم، یانی بەڕاستی فەوتاوم؟ ئاخ خودایە گیان! بەڵام خودا لێرە هیچ کارێکی نییە. لێرە تەنیا شەیتان دەسەڵاتدارە. شەیتانیش ئەم ژنەیە. شەتیان منی خستۆتە بەندەوە و من نامەوێ دیلی دەستی ئەو شەیتانە بم. نامەوێ، شەیتان، بەڵێ شەیتان!»

دیسان ڕۆیشت بۆ لای. دەمانچەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و یەک و دوو و سێ گوللەی لە پشتی ستپانیدا دا. ژنە چەند هەنگاو بۆ پێشەوە هەڵات و کەوت بە سەر مەڵۆ گەنمێکدا.

ژنەکان هاواریان لێ هەستا: «خودایە، خودایە، ئەمە چی بوو؟»

یۆڤگێنی دەنگی هەڵبڕی: «نا، لە دەستم دەرنەچوو. من بە ئانقەست کوشتم. کەسێک بنێرن بە دوای پۆلیسدا.»

گەڕایەوە بۆ ماڵێ و بەبێ ئەوەی لەگەڵ ژنەکەی قسە بکات، لە نێو ژووری کارەکەیدا خۆی بەند کرد.

لە پشت درگاکەوە هاواری کرد: «مەیە بۆ لام. بە زوترین کات خۆت تێدەگەی.»

کاتژمێرێک دواتر قامکی بە زەنگەکەدا نا و بەو نۆکەرەی گوت کە وەڵامی زەنگەکەی دایەوە: «بڕۆ بزانە ستپانیدا هێشتا زیندووە؟»

نۆکەر کە لە ڕووداوەکە ئاگادار بوو گوتی: «سەعاتێک دەبێ گیانی لە دەست داوە!»

ــ باشــە، زۆر چــاکە! ئێســتا بــڕۆ کاتێــک پــۆلیس و دادوەر دێــن ئاگادارم بکە.

ئەفسەری پۆلیس و دادوەر بەیانیی ڕۆژی دوایی هاتن و یۆڤگێنی دوای ئەوەی ماڵئاوایی لە دایکی و ژن و منداڵەکەی کرد، بردیان بۆ بەندیخانە.

دادگاییان کرد. لەو ڕۆژانەدا دادگایی لە لایەن لێژنەی دادوەرییەوە یاسایەکی نوێ بوو. ئەو جینایەتەیان وەک شێتییەکی کاتی لە قەڵەم دا و ئەویــان ناچــار بە تــۆبە و ســزای کلیســایی کــرد. نــۆ مانــگ لە بەندیخانەدا مایەوە و یەک مانگ لە پەرستگەیەک بوو جانکوش.

کاتێــک لە بەنــدیخانە بــوو شــەڕابی دەخــواردەوە و کە چــوو بــۆ پەرســتگاکەش، درێــژەی بە مەیخــواردنەوە دا و کاتێــک گەڕایەوە نێــو مــاڵ و خێــزانەکەی، پیــاوێکی لاواز و مەیخــۆر و دەستەوســتانی لــێ دەرهاتبوو.

ڤارڤارا ئەلکســی یۆڤنا بە دڵنیاییەوە پێداگریی دەکرد کە هەمیشــە پێشــبینیی کــردووە کە زاواکەی لە ئاکامــدا خــۆی بەو دەردە دەبــا. بە شــێوەی قســە کردنیــدا ئەوەت بــۆ دەردەکەوت. لیــزا و ماریــا پاولۆڤنــا

هەرچی مێشکی خۆیان هەڵگوشی و بیریان لێ کردەوە نەیاندەزانی بۆ دەبێ ئەو ڕووداوە قەومابێ. باوەڕیان بە پزیشکەکانیش نەدەکرد کە گوتیان یۆڤگێنی بە هۆی ئاڵۆزیی مێشک و ئاوەزەوە خۆی تووشی ئەو بەڵایەی کردووە. ئەوان بە هیچ شێوەیەک نەیاندتوانی ئەوە بە خۆیان بسەلمێنن کە یۆڤگێنی کارێکی ئاوای کردبێ. چونکە ئەو لە سەدان کەسی خزم و ناسیاوی دەوروبەری ئاقڵتر و تەندروستتر بوو.

هەر بەڕاستیش ئەگەر یۆڤگێنی لە کاتی ئەو کارەساتەدا وەک شێت بێنینە ئەژمار، دەبێ هەموو خەڵک بە شێت و ناهیر بزانین. هەروەها شێتتر لە هەمووان بێ گومان ئەو کەسانەن کە شوێنەواری شێتی لە خەڵکیدا دەبینن بەڵام لە خۆیانیدا نابینن.

یاسنایا پۆلیانا
نۆڤامبری ١٨٨٩

# فەرهەنگۆک

**بژارەوار:** گیاوگژی هەرزی نێو بێستان و مەزرا

**بیرسایی:** مەنتقی (منطقی)

**بێشەوان:** جەنگەڵبان، نیگابانی دارستان

**بەروانکە:** بەرهەڵبێنەیەک لە بەر سینگە و بۆ خوارێ دایدەپۆشێ. بەرسینگە

**پاناوک:** تەنگاو، دەراوی چۆم کە ئاوەکەی تەنکە و بڵاو دەبێتەوە

**پەنامەکی:** نهێنی، کردنی کارێک بە نهێنی.

**تریق بوونەوە:** شەرمەزار بوون، خەجاڵەت بوونەوە، بە خۆدا شکانەوە

**تۆلاز:** حیز، هەوەسباز، داوێن پیس

**تەیمان:** پەرژین، تانۆک، چەپەر (پرچین)

**جانکوش:** مجێوی کلێسە، خزمەتکاری کەنیسە

**چەپۆکان:** هەستانە سەر پاشوو و سم لە زەوی کوتانی ئەسپ

**چەناگەشکاو:** برێتی لە چەنەوەر و زۆربڵێ، دەم چەپڵە

**خاپینۆک:** فریودەر، کڵاوچی

**دێمۆدە:** لە باو کەوتوو (مبتذل)

**دەروەچ:** دەربیجە، دەلاقە

**ژەقنەمووت:** برێتی لە زۆر تاڵ

**ساجوور:** فیشەکدا، دەراغ (خشاب)

**سایەچەور:** دەستودڵ باز، بەدەهەندە، دڵ هەراو

**شکستۆک:** شتێک کە لە شکان نزیکە یان دەشکێ

**غەور**: ژەنگ و کەڕووی سەر ئاوێنە
**فسۆک**: خوێڕی، بڕێتی لە ترسەنۆک
**فۆسفات**: پەین و کوود کە بە زەوینیەوە دەکەن
**قونجڕ**: قولینچک، سووچ، قوژبن
**قەڵەنگ**: داردەستێکە سەرەکەی وەک گۆچان وایە
**کەوێڵ**: ماڵۆچکەی نێو باخ و مەزرا، چارداخ
**گزیر**: کوێخا، پێشکار، بریکاری ئاغا
**لاقرتیکەر**: حەنەکچی، قەشمەر
**لاکان**: کاشە، خێشکی سەر بەفر (سورتمە)
**ناهیر**: گەوج، بیٚمێشک، نەفام (ابلە)
**هەوجاڕ**: گاسن، ئامووری جووت کردن

# بەرهەمە چاپ کراوەکانی ئەمین گەردیگلانی

١) تاپۆی وەرزێکی سەوز، کۆمەڵەشیعر، چاپخانەی شوعاع تەورێز، ١٩٩٧

٢) شەوەژانی ئەستێرەیەک، کۆمەڵەشیعر- تاران، نشر عابد، ٢٠٠٠

٣) مەرگەخەون، کۆمەڵەشیعر، تاران، نشر پیام امروز، ٢٠٠٣

٤) دیسان لەو شەقامانەوە، کۆمەڵە چیرۆکی بیژەنی نەجدی، وەرگێڕان، ئاراس، ٢٠٠٥

٥) تەپڵی ئاور، کۆمەڵە چیرۆکی بیانی، وەرگێڕان، ئاراس، ٢٠٠٥

٦) جێگای بەتاڵی سلووچ، ڕۆمان، مەحموودی دەوڵەتئابادی، وەرگێڕان، موکریانی، ٢٠٠٦

٧) خۆر و لاولاو، کۆمەڵە شیعری منداڵان، بۆکان، چاپخانەی داهاتوو ٢٠٠٧

٨) یەکگرتن، چیرۆکی منداڵان، قودسی قازی نوور، وەرگێڕان، ئاراس، ٢٠٠٧

٩) برایانی کارامازۆف، ڕۆمان، فیۆدۆر دۆستۆیۆفسکی، وەرگێڕان، موکریانی، ٢٠٠٧

١٠) خولیای نووسین، کۆمەڵە وتار_ ڕەزا بەراهەنی، وەرگێڕان. موکریانی، ٢٠٠٨

١١) فەرهەنگی ڕێژگە (ئەو وشانەی لەهەنبانە بۆرینەدا نەهاتوون)، موکریانی ٢٠٠٩

١٢) کەڵەشێری ورگن، چیرۆکی منداڵان، فۆلکلۆر؛ نووسینەوە، بۆکان، ئیزیرتوو، ٢٠٠٩

١٣) تازیەبــارانی بەیەل، ڕۆمــانی غوڵامحوســێن ســاعیدی، وەرگێــڕان، موکریانی٢٠١١

١٤) مەرگی ئیڤان، ڕۆمان، لئۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان، موکریانی، ٢٠١١

١٥) دار وپەپــووله و ڕووبــار، چیرۆکــی منــداڵان، فەریــده شەبانفەرــ وەرگێڕان، ٢٠١١

١٦) دیلی قەفقاز، ڕۆمان، لئۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان، موکریانی، ٢٠١١

١٧) باوکە سێرگی، ڕۆمان، لئۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان، موکریانی، ٢٠١١

١٨) ئاغا و نۆکەر، ڕۆمان، لئۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان، موکریانی، ٢٠١١

١٩) هاوسەرگیری بەختەوەرانە، ڕۆمـان، تۆلسـتۆی، وەرگێـڕان، هەولێر، خانەی کتێبی ئاوێر ٢٠١٢

٢٠) نارنجی فڕین، چیرۆک، وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠١٢

٢١) ئانا کارنینا، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕان، موکریانی، ٢٠١٢

**ئەم بەرهەمانەش ئامادەی چاپن:**

١) ئاپۆرەی خەو، کۆمەڵە شێعر

٢) کازاخەکان، ڕۆمان، لئۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان

٣) سترانی شەپۆلەکان، شێعری هاوچەرخی فارس، وەرگێڕان.

4) ڕێگایەک بەرەو هەتاو، کۆمەڵەچیرۆک، وەرگێڕان

5) شارەزاییە بنەڕەتییەکانی ژیان، دووروتی ڕیچ، وەرگێڕان

6) پەسڵان، ڕۆمان، لیۆ تولستوی، وەرگێڕان

7) هاوار و ژیلەمۆ، کۆمەڵە شیعر